# کوردستانی نوێ‌م چۆن دەوێ؟

چەپکێك لە وتارەکانی

هەڤاڵ مام جەلال لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا

**ئامادەکردنی: سۆران عەلی**

سلێمانی- 2012

■ ناوی کتێب: **کوردستانی نوێ-م چۆن دەوێ؟**

■ نووسەر: **مام جەلال**

■ چاپ: **چاپی یەکەم**

■ نەخشەسازی: **شۆڕش ئەحمەد**

■ بەرگ: **ئاوارە هیوا**

■ چاپ: **چاپخانەی شڤان**

■ تیراژ: (500 )

■ **لەبڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ**

## وتەیەك

ئەوی لەم کتێبەدا کـۆکراوەتەوە هەمـوو وتە و وتـار و قـسەکانی هەڤـاڵ مـام جەلال نیـیە، بەڵکـو ئەمە بەشـی هەرە زۆری ئەو نووسینانەیەتی کە تایبەت بۆ کوردستانی نوێی نووسیوون.
وتـار و چاوپێکەوتنەکـانی، پـۆلینکردن و کـۆکردنەوە و کـاتێکی زیاتر دەخوازێت کە هیوادارین رۆژێك بتوانین ئەو فەرمـانە حـزبییە، کوردایەتییەش جێبەجێ بکەین.
کوردستانی نوێ سەربەرزە بەم نووسینانە کە هـی وایـان تێـدایە سیاسـەتی گـشت یەکێتـی و کـوردایەتی روون دەکـاتەوە و هەندێکیشیان ئامۆژگاری و دەستخۆشی و رەخنەشن لە کوردسـتانی نوێ و بەشێکیشی وەفاداری (مام)ن بۆ دۆست و هاورێ دێرینەکـانی لە کاروانی خەباتی کوردایەتی بە گشتی و هی یەکێتـی نیـشتیمانی کوردسـتانیش بەتـایبەتی. بێگومـان جـگە لەپیرۆزبـایی سـاڵانەی لەدەرچـوونی کوردسـتانی نـوێ، نووسـینی تریـشی هەبـوون کە سەروتار، یان بەناوی رۆژنامەکەوە بڵاوبوونەتەوە. سـاغکردنەوەی ئەو

نووسینانەش بێگومـان بەدواداچـوونی وردتـر دەخوازێـت کە فریـای یـادی بیـست سـاڵەی کـاروانی کوردسـتانی نـوێ نەدەکەوت، بـۆیە عەرەب گـوتەنی (مـالا یـدرك جـله، لا یتـرك کـله) لەبەر ئەوە ئەم گوڵبژێرەمـان هەڵبـژارد کە دیـارییەکی بچـووکە بـۆ خـوێنەران و ڕێزلێنانێکی بچووکی بنەماڵەی کوردستانی نوێـشە لە کۆشـشی مـام جەلال وەك نووسەر و خەبات گێـڕ و هاوکـارێکی ئەم ڕۆژنـامەیە لە هەموو قۆناغەکانیدا.

لێرەشـدا بەنـاوی ڕۆژنامەکەمـانەوە سـوپاس و دەستخۆشـی لەهاوپیـشەی دێرینمـان کـاکە سـۆران عەلـی دەکەیـن کە ئەرکـی ڕێکخستن و ئامادەکردنی ئەم نووسینانەی گرتە ئەستۆ و دەستەکانی خۆشبن.

**کوردستانی نوێ**

# "کوردستانی نوێ"م چۆن دەوێ؟

هەڤاڵان بەڕێوەبەرانو نوسەرانی بەرێوەبەری کوردستانی نوێی خۆشەویست بەسڵاوێکی برایانەی گەرمەوە پیرۆزبایی ساڵڕۆژی دەرچوونی رۆژنامەکەتان لێدەکەم کوردستانی نوێ لەخەڵکی کوردستانی نوێ کوردستانی رزگارکراو دیموکرات پیرۆزبێت.

دەرچواندنی کورستانی نوێ ئەوەش بۆماوەی ساڵێک بێپسانەوەو وەستاندن خۆی لە خۆیدا شارێکی رۆژنامەگەری نوێی کوردەواریو کوردایەتییە، بەڵام درێژەپێدان ئەویش بەگەشەپێدانەوە کارێکی گرنگترو بەکەڵکترە ژیان ناپسێتەوەو ناکوژێتەوە. بۆیەش دەبێ لایەنەکانی بەلایەنی هۆشیاریو رۆژنامەکە ریشەوە نەپساوەو بەردەوامو گەشەکردووین بۆیەش دەبێ هەمیشە بەتەمای پێشکەوتنو گەشەکردنی کوردستانی نوێدابین.

دیارە بۆتان هەیە شانازی بەوەوەبکەن کە دەسپێشکەربوونە لە دەرچواندنی یەکەمین رۆژنامەی رۆژانەی کوردی ئەویش بۆماوەی ساڵێک کەئەمە بۆیەکەمجارە لە مێژوی کوردستانی عیراقدا روودەدات... بگرە لە مێژووی هەموو کوردستاندا.. بەڵام هەقی شانازی شۆڕشگێڕانەتان هەیە، نەک هەقی لەخۆبایی بوونو خۆلێگۆڕانو... زلی (دەردی سۆرانی دەڵێن) سوپاستان دەکەین لەسەر ئەرکو هەوڵو کۆششو رەنجو ماندووبوونتان، بەڵام داوامان پەرەپێدانو باشتربوونە.

من پێم باشه ڕەئی خۆمتان پێڕاگەیێنم... با ئەمایان ڕەئی تایبەتی خۆم بێ!.

هەقە کوردستانی نوێ زیاتر بایەخ بەدەنگوباسی دەرەوە بدات خەڵک دەنگوب اسی تەڕوتازەی لێتان گەرەکە دوا دەنگوباس دیارە گرنگو بایەخدارەکانیش.

هەقە زۆرتر باشتر دەنگوباسەکانی ناوخۆ کۆکەنەوە بڕازێننەوە فرە بابەتو جۆراوجۆرتریان بکەن:

ژیانی کوردەواری (المجتمع الكردی)و کوردایەتی (خەباتی رزگاریو دیموکراتی خەڵکی کوردستان) چاکترو زۆرتر لەلاپەڕەکانتاندا ڕەنگو دەنگ بدەنەوە.

هەقە هەمیشە مانشێتو سەروتارتان هەبێت ئەگینا ڕۆژنامەکەتان کەچەڵ دەبێت!.

لاپەڕە دوو باشە، بەڵام هەقە باشتری بکەن بەباسی تێروتەسەل لەسەر ڕووداوە گرنگەکانی جیهان بەگشتیو ڕۆژهەڵات بەتایبەتی.

با لاپەڕە سێ بیروباوەڕی ئازاد، ڕەخنەگرانە لێکدانەوەی جۆراوجۆری وەزعی عیراقو کوردستان بگرێتەوە.

با دەرگای ڕەخنەو بیروبۆچونی ڕەنگاورەنگو جۆراوجۆر لەسەر پشت بکەینەوەو ئۆباڵیش بەئەستۆی نووسەر!.

هەقە پتر لە دەنگوباسی بەرەی کوردستانیو لایەنەکانی بڵاوبکەنەوە هەقە لەلاپەڕە شەشدا تەرجومەی وتارو باسە گرنگەکانی دونیا، یان پوختەیەکیان بڵاوبکەنەوە!

پێشنیازدەکەم بیکەنە لاپەڕەیەک بۆ گوتەی ڕۆژنامەکانی جیهان لەسەر مەسەلەکانی ڕۆژهەڵاتو عیراقو کوردستان لە ناوەڕۆکی وتارەکانیشدا هەقە زۆرتر، پتر درێژدادڕانە سووربن لەسەر

داواکـردنو پاراسـتنی مافەکـانی بـرا تورکمـان، بـرا ئاسـوری، بـرا مەسیحیەکان.

هەقە زۆرتر باسی برا ئیزیدییە خۆشەویستەکانمان بـکەن واباشـە لاپەڕەی هەفتانەی ژنانو گیروگرفتو خەباتیان بکەنەوە.

پێم باشە لاپەڕەی هەفتانەی کرێکاران، جوتیـاران، خوێنـدکاران، مامۆستایان... هتد بکەنەوە.

هەڤاڵینە هەر ئەوەندەم لەبیرە، بەڵام دیارە ئێوەش بەشایـستەی ئەو هەموو (هەقە)و (پێم باشە)و پێشنیارانە دەزانم بـۆیە دووپـات دەکەمەوە ئێوەی تێکۆشەرو خۆشەویست.

هەرشادو سەربەرزو سەرکەوتووبن

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

ژمارە (**290**)، رۆژ (**1993/1/12**)

# لەپێناوی گەشەپێدانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا

یەکەم: یەکێتی نیشتمانی کوردستان (بە ئیعترافی دۆستو دوژمن) بۆتە هێزێکی گەورەی کاریگەر لە کۆڕی خەباتی دیموکارتیو رزگاری کوردستانو عیراقدا.

بەهاوکاری هەموو هێزەکانی تری بەرەی کوردستانی بە تایبەتی (پ.د.ک) تواندراوە کە کوردستان بەم رۆژە بگەیێنین رۆژی رزگاریو دیموکراسیو مافی چارەی خۆنوسن بەشێوەی فیدراڵ هەمووکەسیش دەزانێ کە (ی.ن.ک) چ فیداکاریو دڵسۆزی نواندوەو چۆن بەرپرسیارانە لەو خەباتە پیرۆزەدا رەفتاریکردوە بۆیە پێویست ناکات زۆری لەسەربڕۆین.

دووەم: (ی.ن.ک) لە یەکەمین گۆنگرەی گشتی خۆیدا نەک هەر بەمیراتگری رەوای هەموو سەروەریەکانی خۆیو شەهیدەکانی مایەوە، بەڵکو چەند ئەرکێکی گرنگی پڕ لە شانازیشی بەدیهێنا کە هەمەڕەنگو دیارەکانیان ئەمانەی خوارەوەبوون.

1-یەکخستنی هەموو باڵەکانی (ی.ن.ک) لەناوی (ی.ن.ک)دا واتە گەشەپێدانی یەکێتی ناو داهێنانی پرۆسێسێکی نوێش لە جولانەوەی رزگاریو دیموکراتی خەڵکی کوردستاندا پرۆسێسی

یەکخستنەوەی هێزە پچڕپچڕو لێکدابڕاوەکان یەکگرتنەوەی دوورکەوتوەکانو جیابووەکان.

لەهەمان کۆنگرە بانگەوازی یەکخستنی هەموو هێزەسیاسیە وێکچووەکانیش جاڕدرا.

2-دارێژتنی ڕێبازی سیاسی روونو ئاشکرای دووربینانەی راستوڕەوا بۆ (ی.ن.ک) کەتێیدا هەڵوێستی راست لە میریو لە ئۆپۆزیسیۆنی عیراقی لە گفتوگۆ لەگەڵ میری نیشاندرا. کەتێیدا دروشمە سەرەکیەکان بەمافی چارەی خۆنوسینو بەدیهێنانی هەموو سەرەتاکانی مافی مرۆڤیشەوە چەسپێندران ئەوەش ڕێبازی هاتو سەرکەوتن بوو ئێستەش زۆر شادین بەوەی کە بەرەی کوردستانو هەموو لایەکمان هەمان ڕێبازی راستوڕەوامان پەسەندکردوە. 3-پەسندکردنی پرۆگرامو پەیڕەوی ناوخۆی (ی.ن.ک) لە پرۆگرامو پەیڕەویشدا تەبیعەتو تایبەتیەکانی (ی.ن.ک)و ئامانجەکانیو شێوەو جۆری بەڕێوەبردنی خەباتو ئەرکەکانو دابەشکردنی کارەکانو مەسئولیەتەکان بەسەر دەزگا جیاجیاکاندا دیاریکراون.

(ی.ن.ک) پێناسەکەی ئەمەی خوارەوەیە.

ی.ن.ک ڕێکخراوێکی سۆشیال دیموکراتە لە پێناوی دیموکراسیو ئازادیو یەکسانیدا دژی دیکتاتۆریو جەنگو داگیرکردنو دەستدرێژی دژی چەوساندنەوەی نەتەوایەتیو چینایەتیو دینی. دژی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ دژی تیرۆرو دژی شۆفینیزمو کۆنەپەرستی لە پێناوی مافی چارەی خۆنوسینو هاوکاریو پێکەوە ژیانی گەلان بە ئاشتیو تەبایی تێدەکۆشێت.

4-دروشمە سەرەکیەکانی (ی.ن.ک)یش لە کۆنگرە کە بەم جۆرەی خوارەوە چەسپێندران:

1-ئاشتیو ئاوادانی

2-رزگایو دیموكراسی

3-مافی مرۆڤو مافی چارەی خۆنوسین

4-پاراستنی یەكێتیەكان (ی.ن.ك) یەكێتی بەرەی كوردستانی یەكێتی رێكخراوە دیموكراتیەكان یەكێتی ریزی گەل

5-ئەركەكانی سەرەكی (ی.ن.ك)یش بەچاكی دیاریكران، كە لە شوێنێكیتری رۆژنامەكەماندا دەیخوێنێتەوە.

6-ئامانجی سەرەكی دووریشمان بەچاكی دیاریكردوە، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە.

... هەربۆیەش (ی.ن.ك) ئامانجی دووری بریتی دەبێت لە كوردەواریەكی بێ زوڵموزۆری نەتەوایەتیو چەوساندنەوەی چینایەتی كە دیارە ئەمەش نابێ بەبی مافی چارەی خۆنوسینو پێشكەوتنی كۆمەڵایەتیو ئابوریو سەناعیو سیاسی كە دەبێ ماوەی مێژوویی پێویستی خۆی ببڕێت، بەرەو سۆشیالیزم. رۆیشتن بەرەو سۆشیالیزم تەنها بە كوردەواریەكی نوێدادەبێت كە لە رووی سەناعی زەراعی تیجاری خوێندەواری. سیاسی ژیانی كۆمەڵایەتیەوە گەشەی كردبێتو پێشكەوتووبێت واتە وردە وردە كەرەستەو شەرتەكانی بینیاتنانی سۆشیالیزمیان هێنابێتەكایەوە.

واتە دەردی لە بەرنامەدا هاتووە ئامانجی دواڕۆژی (ی.ن.ك) پێكهێنانی كۆمەڵێكی سۆسیالیستی دیموكراتیە لە كوردستاندا.

7-ی.ن.ك خەبات دەكات بۆ جێبەجێكردنی راگەیاندنی جیهانی مافی مرۆڤ لە كوردستانو لە جیهاندا.

سێیەم: ی.ن.ك رابوردوەكەی پڕ لە شانازیو سەروەرییە هەر لە هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشو رێكخستنەوەو جۆشدانەوەی

کوردایەتییەوە بەڕێبازی نوێ خەباتی جەماهیری شۆڕشگێڕانەداو ژیانی فرە بیروباوەڕی جیاو فرە حیزبو پێکەوەژیانو گوزەراندنی بیروبۆچونی سیاسیو فەلسەفی جیا بگرە تاسەر چەسپاندنی مافی چارەی خۆنوسین لە خەباتدا تاسەر ئاشتبونەوەی گشتیو پێکهێنانی بەرەی کوردستانیو داهێنانی دروشمەکانی یەکخستنی پ.کو یەکخستنی موعارەزەی عیراقو بە کردەوە کوردستانی بوونو پەیوەندیکردن بە حزبە سۆشیال دیموکراتو سۆشیالیست ئینتەرناسیۆنالو ناساندنی کێشەی رەوای کورد بەگەلانی دنیاوە تا پەیداکردنی دۆستو پشتیوان بۆ خەباتی خەڵکی کوردستانو تەدویلی مەسەلەی کورد بەڵێ لە هەموو ئەوانەدا ی.ن.ک دەورێکی سەرەکیو گرنگی بووە تا گەیشتن بەم رۆژەی رزگاریو دیموکراسیو هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانو دانانی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

ئا ئەم یەکێتیە بەو رابوردوە پڕ لە سەروەریو راستوڕەوابوونی رێبازەکەیو بەم سیمای گەشوو پێشکەوتنخوازو دیموکراتو سۆشیالیستەی ئێستەیشەوە بەو هەموو دروشمە راستو ڕەوایانەی خۆیەوە بەو هەموو جەماهیریەتو تواناو هێزو دەسەلاتەیەوە بۆتە قەلایەکی قایمی کوردایەتیو پێشکەوتنخوازیو دیموکراسی لە کوردستانو عیراقدا هەروەک بۆتە دەسکەوتێکی مەزنی کوردایەتیو سەروەرییەکی نەتەوایەتیو نیشتمانیش کە هەقی پاراستنو گەشەپێدانی بەسەر هەموو دڵسۆزانی رێگەی رزگاریو دیموکراسیو پێشکەوتنەوە هەیە.

واتە نەک هەر ئەندانو لایەنگرانی ی.ن.ک بەڵکو هەموو نیشتیمانپەروەرانو دیموکراتانو ئازادیخوازانو سۆشیالستەکانو

چەپەکانی کوردستان. هەقە بەو چاوە بنواڕنە ی.ن.ک و پاراستنو گەشەپێدانیشی بە ئەرکی پیرۆزی سەرشانی خۆیان بزانن.

هەروەک دەشێو دەبێ (ی.ن.ک)یش بکەینە مەڵبەندی کۆکەرەوەی خەباتگێڕە شۆڕگێڕو دیموکراتو چەپو پێشکەوتنخوازو سۆسیالستەکانی کوردستان بەگشتیو هەموو ئەوانەی پێشتر لەناو (ی.ن.ک)دا خەباتیان کردوە بەتایبەتی وە هەموویان لە ژێر ئاڵاکەو لەناو ریزەکانیدا کۆبکەینەوەو رێکیخەینو هێزو توانایان سازبدەین بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانیو چینایەتیەکانیان.

ئیمڕۆ (ی.ن.ک) هێزێکی جەماهیری گەورەیە. سەدان هەزار هاوڵاتی لە دەوری کۆبۆتەوەو رێکخراوەکانی فراوانو کوردستانگیرن. بۆیە نەک هەرپاراستنی (ی.ن.ک) واجبێکی نیشتمانیو پێویستە بەڵکو گەشەپێدانیشی لە روی چۆنایەتیشەوە شەرتێکی گرنگی هێشتنەوەیەتی بەهێزێکی دیموکراتو سۆسیالیستو پێشکەوتنخوازو چەپ. واتە بۆئەوەی دیموکراتە پێشکەوتنخوازو چەپەکانو سۆسیالستەکان بتوانن لە کوردەوارییو کوردایەتی دەوری کاریگەرو مێژوساز دەوری گۆڕاندنو گەشەپێدانی کۆمەڵایەتیو وەرچەرخاندنەوەی رووداو و دیاردەکان بەلای رێی راستوڕەوادا دەوری بەڕێوەبردنو رێبەریکردنی خەباتی جەماهیر بنوێنن. کەچی پچڕ پچڕبونیان لەنێو هێندێ رێکخراوی بچوکدا دابەش بوونیان سەر هەندێ لایەنی هامشیدا یان بەسەر چەند تاقمو گروپی چکۆلەدا لە زیان گەیاندن بە دەوری مێژوی دیمورکراتە پێشکەوتنخوازەکانو چەپو سۆسیالستەکان بەولاوە جێگەی تێدا بەستەنیەو نابێت بۆیە لەم روەشەوە لە بەرئەوەش هەردەبێ هەموو دیموکراتە پێشکەوتنخوازەکانو چەپە هۆشیارەکانو سۆسیالستە

راستەقینەکان (بەجیاوازی فێرگاکانیانەوە) هەر جێگەی خۆیان لەناو (ی.ن.ک)دا بکەنەوە.

بەلای ئێمەوە رۆژی ئەوەهاتووە کە ئەوانەی لە سەرەتاوە لەناو (ی.ن.ک)دا بوونو پاشان لەبەر هۆی جۆراوجۆر یان بەبیانوی جیاجیا لێی دوورکەوتنەوە یان جودابونەوە بیر لەیەکگرتنەوە بکەنەوە لەناو ریزەکانی (ی.ن.ک)دا لەپێش هەموان ئەوانەی ئالای شۆڕشو حزبی زەحمەتکێشانو حزبی سۆسیالستیان پێکهێناوەو یان لەهەندێ کۆمەڵی بچوکدا خۆیان گرتۆتەوە بەتایبەتی کەهەموو ئەوانەش لەسەرەتادا لە دەسپێکی پێکهێنانی (ی.ن.ک)و هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمانەوە شەرەفی پێکەوە خەباتکردنیان هەبووەو پێکەوە چەندین سەروەری هاوبەشمان تۆمارکردوەو سەدان شەهیدی موشتەرەکمان پێکەوە فیدای گەلو نیشتمان کردووە.

بێگومان بیرکردنەوەش لە یەکگرتنەوە لەناو (ی.ن.ک) هەر دەسپێکی پرۆسەیەکی گرنگی زیندودەبێت کە پاشان دەبێ هەوڵی هاوبەشو کۆمیتەی هاوبەش پێکبهێنرێت بۆ چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە پیرۆزە.

هەروەک لە پێشەوەش پێویستمان بەلێدوانو پۆلیمیکیک هەیە لەسەر ئەو ئەرکە پیرۆزە.

دیارە جگەلەو هەڤاڵو براتێکۆشەرانەی کە کۆن (ی.ن.ک) بوونە تێکۆشەرانیتریش هەیە کە دیموکراتی پێشکەوتنخوازو چەپو سۆسیالستن چ سەربەخۆبوبن چ لەناو حزبێکی تێکۆشەری دێرینی عیراقیدابوبنو ئێمە بوینە کوردستانی هەقە هەمو ئەوانەش سەبارەت بەهۆیەکانی سەرەوە ئەوانیش هەربیر لە کۆبوونەوە لەناو

(ی.ن.ک)دا بــکەنەوە بــۆئەم تێکۆشـــەرانە هــۆیەکی تــریش هەیە ئەویش بریتیە لە:

لەجیــاتی ئەوەی سەرئێــشە بــۆ حــزبە تێکۆشــەرەکەی خۆیــان دروستبکەنو گیروگرفت (هەرچۆنێک بێتو هەرچەند بچوکیش بێت) بــۆ بەرەی کوردســتانی بێنێتەکــایەوە یــان لە جیــاتی پێکەوەنــانی رێکخراوێکی بچوکی کاری نەکەر لە کۆڕی خەباتی جەماهیرو ناتەواو لە گۆڕانــدنی کــۆمەڵایەتیو بەڕێــوەبردنی رووداوەکانــدا باشــتر وایە جــێگەی خۆیــان بەســەر بەرزیەوە بەدەسڕۆیــشتنەوە هەم لەنــاو ئەویشەوەو لەسایەی جەماهیریەتو توانـای زۆری زەوەنـدی ئەویـش دەوری گرنــگو بایەخــدار لە کۆمەڵــدا بنــوێننو کەســانی کــاریگەرو دەســەڵاتداربن لە ئاراســتەکردنی روداوەکانــدا هەروەک دەورێکــیش دەبن لە گەشەپێدانی (چۆنایەتی) هێزێکی سیاسی گەورەی کـۆمەڵ واتە لە گەشەپێدانی (چۆنایەتی) جولاَنەوەی رزگـاری و دیمـوکراتی لە کوردستاندا بەم جۆرەش دەتوانن دەوری فەردیو تـاقمی خۆیـان لەناو کۆمەڵدا سودبەخشو کاریگەربکەن چاکەو باشـەیان بۆخۆیـانو بۆ گەلەکەیان زۆرو زۆرتربێت.

دەی کەواتە بـــا هەمـــوو دیمـــوکراتە پێـــشکەوتنخوازەکانو سۆسیالیــستەکانی کوردســـتان هەمــوو دیمــوکراتە شۆڕشــگێڕو چەپەکــانی کوردســتان بەچــاکی جیــدی بەهێمنــیو دووربینــی بە هۆشیاری و بەژیری بیرلەو بۆچوونەی سـەرەوەمان بـکەنەوەو قـوڵو بـازوی لێـدوانو باسـکردنو لێکۆڵینەوەو بۆچـونی ژیـرانەی خۆیـانی لێهەڵمالن.

دەبـا مونــازەرەیەک (پۆلیمیکیـک) لەســەر ئەم مەسـەلە گـرنگە بەرپاکەینو بەئەنجامی سەرکەوتووی خۆشی بگەیەنین.

پێـشموایە گیـانی شـەهیدە نەمرەکـان بانگمـان دەکـاو دەڵـێ:
بۆپێشەوە بەرەو یەکگرتنەوەی هەمـوو کۆنە یەکیەتیەکـانو هەموو
چەپو دیموکراتە پێشکەوتنخوازو سۆسیالستەکان لەنـاو (ی.ن.ک)
گەشەکردوی ڕێبەردا.

ژمارە (**260**)، ڕۆژ (**1992/12/6**)

# ڕوونکردنەوەیەك
# لەسەر لە پێناوی گەشەپێدانی (ی.ن.ك)

لە وتــاری لە پێنــاوی گەشــەپێدانی —ی.ن.ك- دا هەنــدێ خــاڵ هەنە پێویــستمان بەم ڕوونکــردنەوەی خــوارەوە هەیە. ســەبارەت بەهەندێ گلەییو گازندە:

**یەکەمین:**

بۆچی بانگەوازی یەکگرتنەوە پێکهاتنەوە لەپێش هەموان هەر بـۆ (ئەوانەی ئاڵای شۆڕشو حزبی زەحمەتکێشانو حزبی سۆسیالیتیان پێکهێناوەو یا لە هەندێ کۆمەڵی بچوکدا خۆیـان گرتـۆتەوە)؟ نەک بـۆ هەموولایەنەکـان؟ پێمـووایە وەڵامـی ئەو پرسـیارە لەوتارەکەمـدا دراوەتەوە بانگەوازەکە بەم جۆرەی خوارەوە هاتووە: "بەلای ئێمەوە ڕۆژی ئەوەهاتووە کە ئەوانەی لەسـەرەتاوە لەنـاو ی.ن.ك-دا بـوونو پاشان لەبەر هـۆی جۆراوجـۆر بەبیـانوی جیاجیـا دوورکەوتـونەتەوە یان جودابونەتەوە.

**بیرلەیەکگرتنەوە بکەنەوە....**

واتە داوایەکە بۆ یەکگرتنەوەیە بۆ پێکهاتنەوەیە سەبارەت بەوەی کە هەموویــان پێکەوەبــوونە لە دەســپێکی پێکهێنــانی ی.ن.ك-و هەڵگیرسـاندنەوەی شۆڕشـی نـوێی گەلەکەمانـدا، شـەرەفی پـێکەوە خەباتکردنیــان هەبــووە پــێکەوە چەنــدین ســەروەری هاوبەشــمان

تۆمـارکردووه سـەدان شـەهیدی هاوبەشـمان پـێکەوە فیـدای گەل‌و نیشمان کردوە.

دیارە شتێکی ئاساییە یەگگرتنەوە لە یەککگرتن ئاسانترو ئاسایی ترە پێکهاتنەوەی هاوبەشەکانی دێرین لە بیروڕاو بۆچونو پرۆگـرام‌و پەیڕەو لە یەککگرتنی چەندین لایەنی لێک دوورو بیروڕا لێک جیاوەزو فەلسەفەی دژ بەیەکتر ئاسانترو ئاسایی ترە.

جـگە لەهەمـوو ئەوانەش ئیمـڕۆ رێکخـستنەوەی ناومـاڵی خۆبـاوە! ئەوا نەتەوە پەرسـتەکانی عەرەب (البیـت القـومی العربـی) رێکـدەخەن‌و سـازدەدەن لەپـێش هەمووشـتێکدا، وا ئیـسلامیەکانیش هـەوڵـی رێکخـستنی (البیـت الاسـلامی) دەدەن... بۆ زۆربڕۆین پارتی هاوپەیمانی خۆشـمان لەپێشەوە هەوڵی کـۆکردنەوەی هەمـوو کـۆنە پارتیەکـانی دوای شۆڕشـی ئەیلولی داو کۆیکردنەوە.

بـۆیە زۆر شـتێکی ئاسـاییەو بەجێـیەو رەوایە کە ی.ن.ک لەپێـشەوە هەوڵـدا ناومـاڵی خـۆی (مـاڵی ی.ن.ک)ی دێـرین رێکبخاتەوە.

**دوومین:**

راستە لە بانگەوازەکەدا هەموولایەنەکان بانگنەکراون، بەلأم پێش کـــۆنگرەی ی.ن.ک بەنـــامەی رەســـمی لە زۆربەی هەرە زۆری لایەنەکانمـان داواکـرد کە هەوڵـی یەکگـرتن بـدەین پـێکەوە، بەلأم کەسیان بەدەنگمانەوە نەهاتن.

بۆیە ئەوانە هەقی گلەییـان لە ئـێمە نـیە. جـگە لەمە هێنـدێکیان دەیـانگرێتەوە: ئەوانەی (حزبـی سۆسیالیـستیان پێکهێنـاوە) واتە هەموویان.

**سێیەمین:**

ئـــێمە داوامـــان نەکـــــــــردووەو بانگـــــــەوازەکـــــــــــەمان وانەکـــــــردو کە هەموویــان التحــاق، بە ی.ن.ک وە بــکەن بەڵکــو داوای یەکگرتنەوەمـــان کــرد واتە یەکبــوین لێــک جیــابوینەوە بــایەکبگرینەوە: واتە باپێــک بێیــنەوە ئەویــش بــــــەم جــۆرەی خوارەوە:

بێگومــان بیرکــردنەوەش لە یەکگــرتنەوە لەنــاو ی.ن.ک دا هـــــــــەردەسپێکی پرۆســەیەکی گرنگـــی زینــدوودەبێت کە پاشــان دەبــێ هەوڵــی هاوبـــــــــــەش‌و کـۆمیتەی هــاوبەش پێکبهێنرێـت بـۆ چـۆنیەتی جێبەجێکردنـی ئەو ئەرکە پیـرۆزە. واتە مەســـــەلەکە یەکگـــرتنەوەیە نەک التحـــاق‌و تـــوانەوەی بێسەروبەر.

ئینجـا ئەویـش دەسـپێکی پرۆسـەیەکی گرنگـی گەرەکە کەدەبـێ هەوڵی هاوبەش ئینجا کۆمیتەی هاوبەشـی بـۆ پێکبهێنرێت. هەمـوو ئەوەش بـۆ پێکهـاتن لەسـەر چـۆنیەتی جێبەجێکردنـی ئەو ئەرکە پیرۆزە.

**چوارەمین:**

جــگەلەو هەڤــاڵو بــرا تێکۆشــەرانەی کە کــۆن ی.ن.ک بــوونە تێکۆشـــەرانی تــریش هەنە کەدیمــوکرات‌و پێــشکەوتنخوازو چەپ‌و سۆسیالیــستن. چ ســـەربەخۆبوون چ لەنــاو حزبێکــی تێکۆشــەری عیراقیدا بوون‌و ئێستە بوبنە کوردستانی. بەوانیش ناڵێین‌و نەشـمان وتــوە "التحــاق" بــکەن بەڵکــو گوتومــانە هەقە هەمــوو ئەوانەش سەبارەت بەهۆیەکانی سەرەوە ئەوانیش هەربیـر لە کۆبـونەوە لەنـاو ی.ن.ک دا بکەنەوە.

واته بیربکەنەوە ئەویش لە کۆبونەوە لەناو ی.ن.ک دا ئەویش بە هەڵماڵینی قوڵو بازوی لێدوانو باسکردنو لێکۆڵینەوەو بۆچوونی ژیرانەی خۆیان، واتە ئەویش پرۆسەیەکی گەرەکە.

راستیەکەشی ئەمەیە ئێمە باوەڕمان بە التحاق نیە دژی التحاقین داوای التحاق لەکەس ناکەینو التحاقی کەسیش پەسەندناکەین. بەڵکو ئەو یەکگرتنو یەکگرتنەوەیە ئەو پێکهاتنو پێکهاتنەوەیە پرۆسەیەکی گەرەکە (دوور یان کورت).

**پێنجەمین:**

نیازمان لە زاراوەی چەپی ناو زاراوەکانی تر (مارکسیەکان)و خۆ بە سۆسیالیستی عیلمیزانەکانە. دیارە هەموو پێشکەوتنخوازو دیموکراتێک لە کوردەواری چەپ حسابن بەپێی قۆناغی خەباتی ئیمرۆمان کەدژی دیکتاتۆریەتو کۆنەپەرستین. چەپ بەمانا فراوانەکەی هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام لەناو زاراوەکانی وتارەکەمدا من بۆ مارکسیو سۆشیالیستە عیلمیەکانم بەکارهێناوە.

**شەشەمین:**

ئێمە دەرگای یەکگرتنو یەکبونمان لە روی کەس دانەخستوە، بەڵام پێمانوایە یەکگرتن دەبێ لەسەر هەردوو یان یەکێک لەو بناغانەی خوارەوەبێت:

1- پێکهاتنەوەو یەکگرتنەوەی لێکدابڕاوو لێکتۆراوەکان بێت. چونکە رابردو بیروباوەڕو پرۆگرامو هەڵوێستی گرنگیان یەکبووە. هاوخەباتن هاوسەروەرن هاوشەهیدنو... هتد.

2- یەکگرتن بێت لەسەر بیروبڕواو هەڵوێستو پرۆگرامو پەیڕەو رێبازو سیاسەتو... هتد نەک کۆکردنەوەیەکی هەڕەمەکی بەپەلەو کاڵوکرچ.

حەوتەمین:

لەکاتێکـــدا بـــانگەوازو خەبـــات دەکەیـــن بـــۆ یەکگـــرتنەوەو پێکهاتنەوەی یەکێتیە دێرینەکانو یەکگرتنی پێشکەوتنخوازو چەپو سۆسیالیستە کوردستانییەکان لەناو ی.ن.ک دا نە روتـبە نیـشانمان بەسەر کەسدابەشکردووەو نەناوو ناتۆرەشمان بەکەس داهێناوە.

دەهەمـــوو ئەوانەی خۆتـــان بە دیمـــوکراتو پێـــشکەوتنخوازو سۆسیالیستو چەپ دەزاننو باوەڕتان بەیەک پرۆگـرامو بیروبـاوەڕی پێـشکەوتنخوازو سۆسیالیـستی دیمـوکرات هەیە دەفەرمـوون بـۆ باسوخواسی یەکبوون.. ئەوە ئەرزو ئەوەگەز!

مەیـدانیش مـشکان نەخـواردیە دەردی گـوتەنی!! بەڵام دیـارە بیرکـردنەوەی واقیعیـانە هەر بەوجۆرەدەبێـت هەر بەو رێگەیەمـان دادەبات کە لەوتارەکەدا باسمانکردووە.

بێگومـان پێکهێنـانی ئەو یەکگـرتنەوەش بـۆ هەمـووان بـاشو بەکەڵکە نەک هەرلەبەر ئەوەی کە بەهێزبـوونی هەر لایەکو بـاڵێکی کوردایەتیو بەرەی کوردسـتانی سـەرکەوتنو هێـزە بـۆ هەمـوانی تـر بەڵکو ئەو جۆرە یەکگرتنانە یەکگرتنـی گەورەتـریش ئاسـان دەکەن بەو شـەرتەی لەسـەر یەکێتـی بیـروڕاو فەلـسەفەو پرۆگـرامو دیـدی دوارۆژیش بێت.

ژمارە (**292**)، رۆژ (**1993/1/17**)

# فەرامۆشکردنی کەسوکاری شەهیدەکان، شەرمەزارییە بۆ هەمووما‌ن

لە مام جەلال-ەوە

بۆ کوردستانی نوێی بەڕێز

هەردوو وتارەکەی مامۆستا فوئاد قەرەداغی و هەڤاڵ سەلاح شێخ شەرەفم خوێندەوە، هەردووکیان بەگشتی و هینەکەی هەڤاڵی دێرینمان مامۆستا فوئاد زۆر کاری تێکردم. هیوادارم ویژدانی هەموو ئەوانەشی هەژاندبێ کە بەشدارییانکردووە لە دامەزراندن و بەڕێوەبردن و خەباتە پیرۆزەکەی کۆمەڵەشدا.

بەڕاستی ڕەوای هەق نییە، وەفاداریی نییە بۆ شەهیدە نەمرەکانمان (بە دیار و گومناوەکانیانەوە) هەر تەنها (تروسکەیەکی روونـاکی لە شەوەزەنگی بیرچوونەوەدا بۆ تێکۆشەرێکی چالاکی شانە سەرەکییەکانی کۆمەڵە)، هەڵکردن بەس نییە بۆ یادکردنەوەی شەهیدە نەمرەکانمان، بەڵکو پێویستە هەموو ساڵێک یادیان بکرێتەوە.

ی.ن.ک شانازیی بەوەوە دەکات کە حزبی شەهیدان و سەدان کادر و هەزاران ئەندام و هەزاران پێشمەرگەی فیدای کوردستان و دیموکراسی و رزگاریی عیراقە، یادکردنەوەی شەهیدە نەمرەکان نەک هەر هەقێکی ئاسایی خۆیانە، بەڵکو مایەی سەربەرزی و

سەرووەریشە بۆ ی.ن.ک، بۆیە پێشنیار دەکەم ڕۆژانە لە کوردستانی نوێدا بەشێک بۆ شەهیدان بکەینەوە.

ئەرێ تو گۆڕی شەهیدەکانتان ئەمە باشتر نییە لە تەرخانکردنی بەشێکی دیار بۆ (کوڕی صدام) و (سەفەری هێنری بایندەر)؟.

ئەرێ تو گۆڕی شەهیدەکانتان فەرامۆشکردنی کەسوکاری شەهیدەکان، ئاوڕنەدانەوە لە دایک و خوشک و خێزان و منداڵەکانیان مایەی شەرمەزاری نییە بۆ هەمووانتان، بۆ هەمووانمان، هەر لە منەوە تا ئەندامێکی سادەی ی.ن.ک؟! چ جای هاوڕێیانی شەهیدان؟ هاوڕێیانی زیندان و ئەشکەنجەدان و ڕۆژانی تاڵ و سەختی خەبات؟!.

مامۆستا فوئاد باشی پێکاوە، دەڵێ:

"ئەی هاوڕێیانی فەهمی چ ئەوانەی لە سەرکردایەتیدان یان لە ناوەند و کەرتەکانی ڕێکخستندا، هەر هیچ نەبێ بە وەفاداری بۆ هەڤاڵە سەرنگونکراوەکەتان، ئەو دەنگانەمان لە دەوروبەردا بۆ کپبکەن کە نەفرەت لە کاری سیاسی و تێکۆشان و کوردایەتی و مەبدەئیەت و...هتد دەکەن و پاساوی نەفرەتەکانیشیان لەبیرچوونەوەی کەسانی وەک فەهمی دەدەنەوە".

بەڵام مامۆستا فوئاد باشی نەپێکاوە کە هەوڵ دەدات جۆرێک پاکانە بۆ بێدەنگیی خۆی بکات لەئاستی هاوڕێیەکی دلێری خۆیدا کە شەهیدی نەمر فەهمی قەرەداغییە لەبەرئەوەی برایەتی و لە ترسی هەندێ بۆچوون و دڵەختورەی هەندێک و....هتد.

من پێموایە کاک فوئادی دۆستی دێرینمان بەرپرسیارە، ئەرکی سەرشانیەتی نەک هەر قەڵەمی تیژ و بیری ژیری بخاتە کار بۆ فەهمی جوانەمەرگ، بەڵکو بۆ هەموو هاوڕێیەکانیش، بەتایبەتی

ئەوانەی چالاکانە لە شانە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەدا کاریانکردووە کە مامۆستا فوئاد یەکێکە لەوانەی شەرەفی پێکەوەنانی کۆمەڵەی هەبووە، واتە بەرپرسیارە لە هاندان و رێنوێنیکردنی ئەو نەمرانە و تێکۆشەرانی زیندووی رێگەکەشیان. هیچ نەبێ لەبەر ئەم هۆیە و چەندین هۆی تر.

ژمارە (**1165**)، رۆژ (**1995/12/14**)

# لە مام جەلالەوە
# بۆ گشت هەڤاڵانی (ی.ن.ك) و
# هێزی پێشمەرگەی کوردستانی نەبەز

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم...

لای هەمووتان ئاشکرایە کە ژنان نیوەی کۆمەڵن و دایکی جیلی ساوا و لاو و ڕۆڵەی دواڕۆژن. هەروەک ئەرکی پەروەردەی نەوەی نوێی کوردەواریشیان لەئەستۆیە.

لەناو ژنان، هێز و توانا و هۆش و وزەیەکی هەمەجۆر و هەمەچەشنە هەیە. خستنەگەڕیان، هێنانە جۆش و خرۆشیان، توانا و هێزی کۆمەڵی کوردەواری دوو بەرابەر دەکات و گوڕ و تەوژمێکی تر دەدات بە جوڵانەوەی ڕزگاری و دیموکراتیی خەڵکی کوردستان. هەروەک دەبێتە هۆی پڕکردنەوەی چەندین کەلەبەر و ناتەواوی لەناو کۆمەڵ و جوڵانەوەکەدا.

هەر بۆیەش (ی.ن.ک) بەپێویستی دەزانێ کە بایەخ و ئەهمیەتێکی زۆروزەوەندە بە ژنانی کوردستان بدرێت.

هەر بۆیەش یەکخستن و ڕێکخستن و سازدانی ژنانی کوردستان و خستنەگەڕ و هێنانە جۆشی توانا و وزە و هۆش و وریایان زۆر زۆر بە کەڵک و پێویستن بۆ گەشەپێدانی کوردەواری و پتر جۆشدانی کوردایەتی و دامەزراندنی کۆمەڵێکی مەدەنیی شارستانی.

سەبارەت بەو ڕاستییانەی سەرەوە و بۆ بەدیهێنان و جێبەجێکردنی سەرەتاکانی دیموکراسی و سۆشیالیزم کە (ی.ن.ک) وەک حزبێکی سۆسیال دیموکراتی پێشکەوتنخواز باوەڕی پێیان هەیە، پێویستە لەسەر هەموو ئەندامانی (ی.ن.ک) و پێشمەرگە دلێرەکانی (ە.پ.ک) کە خۆیان و لایەنگران و دۆستانیشیان هاندەن بۆ هەڵسان بەم ئەرکانەی خوارەوە:

1- هاندان و هۆشیارکردنەوەی دایک و خوشک و کچ و ژن و دەزگیرانی خۆیان بۆ بەشداریکردن لە ڕێکخستنی (ی.ژ.ک) و چالاکییەکانیدا.

بەشداریکردنیان نیشانەی دڵسۆزی و پەرۆشییانە بۆ کوردەواری و کوردایەتی و (ی.ن.ک) و پێشمەرگایەتی.

2- هاوکاریکردنی (ی.ژ.ک) و چالاکییەکانیان بەپێی توانا و هەریەکە لەئاستی خۆیەوە.

3- ڕێزگرتن لە (ی.ژ.ک) و خەبات و داخوازییەکانیان.

4- نەک هەر خۆدوور راگرتن، بەڵکو بەگژاچوونی تیرۆر و کوشتنی ژنان و سووکایەتی پێکردنیان.

5- داکۆکیکردن لە مافی ڕەوای ژنان لە وەکیەکی لەگەڵ پیاوان+ ئازادیی شووکردن+ قەدەغەکردنی ژن بەژنەی بەزۆر+ بەزۆر بەشوودانی کچان و کچانی مناڵ و شیرەخۆر و هتد.

6- بەگژاچوونی فرەژنی و تەڵاقدانی ناڕەوا مەگەر لەبەر هۆی تەندروستی و مناڵنەبوون و بێ ڕەوشتی دیار و ئاشکرا بێت.

هەڤاڵانی تێکۆشەر...

پێشمەرگە قارەمانەکان...

بەدیهێنـــانی ئەو ئامۆژگاریانەمـــان نیـــشانەی دڵــسۆزیتانە بــۆ (ی.ن.ک) و پەرۆشـیتانە بـۆ سـەرکەوتنی دروشـم و سـەرەتاکانی، هەروەک وەفادارییشە بۆ گیانی شەهیدە نەمرەکانتان.

جگە لەوەی کە شەرتێکی سـەرەکی و هەرە گرنـگ و بایەخـداری پێشکەوتن و گەشـەکردنی کـوردەواری و سـەرکەوتنی کـوردایەتی و (ی.ن.ک)یشە.

بۆیە داواکارم لە هەمووانتـان بەوپەڕی دڵـسۆزی و هۆشـیارییەوە ئەو ئامۆژگارییانەی سەرەوە جێبەجێ بکەن.

بۆ پێشەوە رووەو سەرکەوتن

**برای دڵسۆزتان**

**مام جەلال**

**سکرتێری گشتیی (ی.ن.ك) و فەرماندەی گشتیی (ە.پ.ك)**

**1999/3/12**

ژمارە (**1823**)، رۆژ (**1999/3/16**)

# بەبۆنەی یادی (23) ساڵەی دامەزراندنی ی.ن.ك

هەڤالانی خەباتگێڕ،

دۆست و لایەنگرانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیی بەڕێز

بە سڵاوێکی گەرمەوە پیرۆزبایی ڕۆژی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانتان لێدەکەم و ئاواتی سەربەرزی و سەرفرازیتان بۆ دەخوازم، بەهیوای ئەوەی ئەو یادە ببێتە هاندەرێکی تر بۆ ئەوەی چاکتر و باشتر درێژە بدەن بە خەبات و پەرەش بدەن بە چالاکی و هەوڵ و کۆششەکانتان لەپێناوی چاکتر خۆڕێکخستنەوە و پتر گەشەدان بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

جەماوەری تێکۆشەری خەڵکی کوردستان

پیرۆزبایی پێکهێنانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەئێوەش دەکەم سەبارەت بەوەی کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ناوجەرگەی ئێوەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانج و ئاواتەکانی ئێوە پێکهاتووە.

لە زەنگی تاریکی و ناهومێدی و سەرلێشواوی و هەرەسهێنانی شۆڕشەوە هەتا ئیمڕۆ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان چەندین سەرکردەی نەمر و سەدان کادری پێشکەوتوو و لێهاتوو و هەزاران ئەندام و پێشمەرگەی قارەمانی خۆی بەخشیوە بە خەبات و شۆڕشی کوردایەتی، بەو هەموو فیداکارییەش دەستکەوتی گرنگی

بە خوێنی گەشی شەهیدە نەمرەکانی لە مێژووی گەلەکەیدا بۆ خەڵکی کوردستان تۆمارکردووە.

هەڵساندنەوەی کوردایەتی و بوژاندنەوەی خەباتەکەی، هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێ، گەیاندنەوەی دەنگی زوڵاڵی کوردایەتی بە گەلانی ناوچەکە و دونیا، پێکهێنانی بەرەی کوردستانی، خۆسازدان و خەڵک سازدان بۆ راپەڕینە مەزنەکەی ئازاری 1991 و رێبەریکردنی هەڵمەتی دلێرانەیان بۆ رزگارکردنی بیتوێن و رانیە و قەڵادزە و کۆیە و شەقڵاوە و سلێمانی و هەولێر و کەرکوک و لە (بادینان)ی قارەمانیش بەشداری چالاکانە لە راپەڕینەکەیاندا، ئنجا پێکهێنانی یەک لەدوای یەکی بەرەکانی موعارەزەی عیراقی، خۆسازدان بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان و ئنجا پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بەشداریی چالاکانە لە ئاوەدانکردنەوەی دێهاتی کوردستان و پەیداکردنی یارمەتیی دەرەوە و هەوڵی بێ وچان لەگەڵ ئەمریکا و ئەوروپا بۆ سەلماندنی داوا ڕەواکان و یارمەتیدانی گەلەکەمان، ئەوانەش شانبەشانی هەوڵی نەپساوە لە گۆڕەپانی دەرچوواندنی گۆڤار و رۆژنامە و کتێب و دامەزراندنی رادیۆ و تەلەفزیۆنی کوردی، پەرەپێدانی چالاکیی ئەدەبی و فەرهەنگیدا، ئەو سەروەرییانەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە بەدیهێنانیاندا دەوری سەرەکی و دیاری نواندووە.

دەبا گیانی شەهیدە نەمرەکانیش لە بەهەشتی نەمریدا دڵنیابن کە ڕێگەی پیرۆزیان هەردەم پڕە لە خەباتگێڕی نەبەز کە دروشمە دێرینەکەی کوردستان یان نەمان بەسەریانەوە دەشەکێتەوە، کە سوورن لەسەر درێژەدان بە خەباتی پیرۆز لەپێناوی ئاشتبوونەوەی

گشتی، رزگاری و دیموکراسی و مافی مرۆڤ و مافی چارەی خۆنووسیندا.

**هەڤاڵتان**

**مام جەلال**

**1998/6/1**

ژمارە (**1627**)، رۆژ (**1998/6/4**)

# له مام جه‌لاله‌وه

# ئاگادارییه‌ك بۆ گشت لێپرسراوانی ی.ن.ك

له‌ژماره (1887)ی كوردستانی نوێی خۆشه‌ویستدا كه له‌رۆژی 1999/6/22دا بڵاوبۆته‌وه، چاوم به‌ناڕه‌زایی به‌ڕێز قوبادی جه‌لی زاده كه‌وت له‌واسیته‌و ته‌كلیف. به‌و بۆنه‌وه ده‌مه‌وێ ئه‌م ئاگادارییانه‌ی خواره‌وه بڵاوبكه‌مه‌وه:

1- هیچ لێپرسراوێكی ی.ن.ك، چ له‌رێكخستندا بێت یان له ه.پ.ك دا یان كارمه‌ندی میریی خۆمان بێت بۆی نییه هیچ ته‌كلیف، یان واسیته لای حاكمه‌كان بكات. چونكه ئه‌وه به‌پێشێل كردنی سه‌ربه‌خۆیی مه‌حكه‌مه داده‌نرێت‌و سزای حزبی‌و قانونی له‌سه‌ره.

بۆیه جارێكیتر داوا ده‌كه‌مه‌وه له‌هه‌مووان كه ڕێز له‌سه‌ربه‌خۆیی مه‌حكه‌مه بگرن‌و هیچ جۆره ته‌كلیف به‌نامه یان به‌قسه وه هیچ جۆره واسیته‌یه‌ک ئاراسته‌ی هیچ حاكمێک یان (مدعی عام)ێک نه‌كه‌ن، ئه‌گینا خۆیان تووشی سزای قورس ده‌كه‌ن.

2- تكای برایانه‌شم له‌هه‌موو ئه‌وانه‌ی له‌مه‌حكه‌مه‌كاندا كارده‌كه‌ن ئه‌مه‌یه كه ده‌ستبه‌جێ سكرتاریه‌ته‌كه‌ی من ئاگاداربكه‌نه‌وه له‌وانه‌ی ته‌كلیفیان لێده‌كه‌ن یان واسیته‌یان پێده‌كه‌ن.

3-تكام وايە کە م.س- ی بەڕێزو سەرۆکایەتی حکومەتی هەرێمو فەرماندەیی گشتی ە.پ.ک-یش ئەم ئاگادارییەم بەسەر هەموو لایەکدا بڵاوبکەنەوەو خۆشیان چاودێری جێبەجێکردنی بکەنو سزای ئەوانە بدەن کە دەست وەردەدەن لەکاروباری مەحکەمە. بەجۆرێک کە دەبێ واسیتەو تەکلیف بەتەواوەتی قەدەغەو بنبڕ بکرێن.

4-پێویستە هەموو هەڤاڵێکی ی.ن.ک هاوکاریمان بکات لەدیاریکردنی ئەوانەی تەکلیفو واسیتە لای مەحکەمە دەکەن بۆ سەپاندنی سیاسەتی ی.ن.ک لەبواری سەربەخۆیی مەحکەمەشەوە.

بۆپێشەوە بەرەو حوکمی رەوای قانونو سەروەرییو سەربەخۆیی مەحکەمە لەکوردستانی رزگاردا.

**برای دڵسۆزتان**

**مامجەلال**

**سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان**

**1999/6/22**

ژمارەی (**1889**)، رۆژ (**1999/6/23**)

# ژنان بۆ کەسیان لێ هەڵنەبژێردرا
# بۆ سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان؟

**هەرگەلێک خۆی خۆی رزگار دەکات**
**هەر چینێک خۆی خۆی رزگار دەکات**
**هەر توێژێک لەکۆمەڵدا خۆی خۆی رزگار دەکات**

**دیارە**
**بەهاوکاری لەگەڵ**
**هاوپەیمانەکانیان**

وا چەندین وتار بڵاوکرانەوە دەربارەی هۆیەکانی هەڵنەبژاردنی ژنان بۆ کۆمیتەی سەرکردایەتی ی.ن.ک لەکۆنگرەی دووەمدا. بۆچوونەکان بەگشتی یان کاڵوکرچو عاتیفیانە بوون، یان سادەو دوور لەڕاستوڕەوایی بوون لەدەستنیشانکردنی هۆیەکاندا. بگرە هەندێ بۆچوون خراونەتە ئەو قاڵبەوە کەگۆیا پیاوی کورد هێشتا ئامادە نییە یارمەتی ژنان بدات بۆ وەکیەکیو تەنانەت گۆیا بەقسەی مامۆستا عومەر شێخمووس: "... زۆریش بەداخەوە ئەم قانونە گشتییە لەسەر کۆنگرەی ئەم دواییەی ی.ن.ک-یش تەتبیق دەبێت". کەزۆر بەداخەوە ئەو بۆچوونە نەک هەر نەڕاستو نەڕەوایە، بەڵکو راستەوخۆش بەپێچەوانەی ویستی کۆنگرەو پێکهاتەکەی کۆنگرەی دووەم بوو.

کۆنگرەی دووەم، کۆنگرەیەکی سەرکەوتووی ی.ن.ک بوو. زۆربەی زۆری بەشداربووەکانی کادرو ئەندامی ژیرو هۆشیارو

پێشکەوتنخوازی ی.ن.ک بوون. دیارە زۆر کادری هۆشیارو ژیریتریش هەبوون کەهەڵنەبژێردراوبوون بۆ کۆنگرەکە، لەبەر زۆری ئەو جۆرە کادرانەو مەحدودیەتی ئەندامەتی کۆنگرە. کەهەر بەڕاستی ئەم دیاردەی زۆری کادری ژیرو هۆشیارو سەرڕاستو پاکی ی.ن.ک مایەی شادیو شانازیو سەروەرییە بۆ ی.ن.ک.

جا کەتەئسیری هەڵەو بۆچوونی ناڕاستوڕەوا گەیشتبێتە برایەکی ژیرو هۆشیاری وەک مامۆستا عومەر شێخمووس، کەخۆشی یەکێک بوو لەدەستەی دامەزراندنی ی.ن.کو زۆریشی پێوە ماندوو بووە، بەڵێ کە وابێت پێویست دەکات منیش بێمە ناو کایەی دیاریکردنی هۆیەکانی هەڵنەبژاردنی تەنانەت یەک ژنیش لەکۆنگرەی دووەمدا. بەتایبەتی کەمن دڵنیام کەزۆربەی زۆری کادیرە ژیرەکانی ی.ن.ک زۆریان پێباشو گەلێکیان پێخۆش دەبوو کەنەک ژنێک، بەڵکو چەند ژنێکی ژیرو بەتواناو زاناو لێهاتوو هەڵبژێردرابان بۆ سەرکردایەتی ی.ن.ک، بەڵام دیارە هەمووشیان دژی ئەوە بوون کەژن بکرێ بەدیکۆر لەڤیتریتی ی.ن.ک-دا هەڵواسرێت!.

ئەی کە وایە بۆچی ژنان کەسیان لێدەرنەچوو لەهەڵبژاردنی کۆمیتەی سەرکردایەتیدا؟

من لام زۆر پێویستە بەسەربەستی وەرامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، هەم بۆ دەرخستنی راستییەکانو هەم بۆ دیفاع لەکۆنگرەکەو هەم بۆ دواڕۆژی بوونی ژنانیش لەسەرکردایەتی ی.ن.ک-دا.

یەکەم: ژنە خەباتگێڕە ناسراوە شایستەکان بۆ کۆمیتەی سەرکردایەتی خۆیان نەپالاوت، هەرچەندە زۆریشیان هەوڵ لەگەڵ درا، هەوڵەکەش لەلایەن پیاوانەوە بوو نەک لەلایەن ژنان.

بۆ نموونە هەڤاڵان هێرۆخان، کافیەخان، نەرمینخان خۆیان نەپاڵاوت، هەرچەندە پیاوان زۆریان هەوڵیان لەگەڵ دان. ئاشکراشە هەرسێکیان هەڵدەبژێردران گەر خۆیان بپاڵاوتباو تکاو داوای چەندین کادری پیاوی ناو کۆنگرەیان پەسند بکردبا.

بۆ دڵنیاکردنی هەڤاڵ مامۆستا شێخمووس، کەپیاوان ئامادەبوون یارمەتی ژنان بدەن، بۆ هەڵبژاردنیانو بۆ وەکیەکییان لەگەڵ پیاوان واتە ئەو قانونە گشتییە لەسەر کۆنگرەی دوو تەتبیق نابێت، بۆ دڵنیاکردنی مامۆستا صلاح‌الدین موهتەدی بەشایەد دێنمەوە کەدڵنیام کەکاک هۆمەر باوەڕی تەواوی پێدەکات. کاکە صلاح‌الدین خۆی ئاگای لێبوو کەچەندین کادرو سەرکردەی پیاوی ی.ن.ک هەوڵیان داو گەرەکیان بوو بگرە تکای زۆریشیان دەکرد لەژنانی وەک هێرۆخانو کافیەخانو نەرمینخان تا خۆیان بپاڵێون بۆ ک.س. کەچی هیچیان قبووڵیان نەکرد. دیارە هەریەکەیان لەبەر هۆیەکی تایبەت بەخۆی.

**دووەم:** چوونەدەرەوەی هەندێ خوشکی لێوەشاوەو بەتوانا کەهەم کۆنگرەیان لێبێبەش بوو، هەمیش ماوەی هەڵبژاردنیان نەبوو.

**سێیەم:** خوشکان بەلیستێکی یەکگرتووەوە نەهاتنە پێش، بەیەک دەنگ خۆیان نەپاڵاوت، بەڵکو بەدژایەتی یەکتریشەوە لەلیستی دەستەگەریدا خۆیان پاڵاوت.

دابەشبوونیان (زۆربەیان هیچ نەبێ) بەسەر لیستی دەستەگەریدا هۆیەکی سەرەکیتری دەرنەچوونیان بوو بۆ ک.س. چونکە دەستەگەری لەکۆنگرەدا ئیفلاسی سیاسی کردو ژێرکەوت. تەنانەت لەدەرچوواندنی پیاوانیشدا هیچ دەستەگەرییەک نەیتوانی یەک تاکە

پالێوراوی خۆی دەرچووێنێت کەمۆری ئاشکرای دەستەگەری پێوە بووبێت. بەجۆرێک کەزۆربەی خۆهەڵواسیوەکانیش بەلیستی دەستەگەری بۆیان دەرکەوت کە چ زیانو زەرەرێکیان لەخۆیانو شانسی خۆیانو ناوبانگی خۆیان داوە. بێگومان کەسانی شایستەی ئەندامەتی ک.س هەبوون لەو لیستانەدا، گەر بەناوی دەستەگەرییەوە خۆیان نەپالاوتبا ئەوا بێگومان دەردەچوون بۆ ک.س.

خوشکانیش داری دەستەگەرییان بەرۆحی خۆپالاوتنەکەیان ەوە نا بۆ ک.س.

چوارەم: هەر بەڕاستی کۆنگرەی دووەم شکستی دەستەگەری جارِ دا، کۆنگرەی سووکبوونو ریسوابوونی دەستەگەری بوو. کۆنگرەی ژێرخستنی دەستەگەری بوو. هی دەرنەچوواندنی لیستەکانیان، ئەویش بەشێوەیەکی عەفەوی هەڵقوڵاو لەدڵودەروونی زۆربەی کادیرە ژیرو هۆشیارەکانی ی.ن.ک کەدژ بەدەستەگەری بوون. خۆ گەر هەڤالانی وەک مامجەلال، کاکە نەوە، کاک د.فوئاد، بەئاشکرا دژی دەستەگەری قسەیان بکردبا، دژی لیستەکانیان بدوابان، ئەوا بێگومان هەموو لیستەکان کەمترین دەنگیان دەهێنا. بەلام زۆر باش بوو کەهەر بەشێوەی عەفەویو خۆی لەخۆیەوە، لەناو کۆنگرەکە خۆیدا، دژایەتی دەستەگەری پتر لە75%ی کادیرەکانی وروژاند. پاش کۆنگرەکەش کەڕیسوابوونی دەستەگەری جارِ درا نیسبەتی بێزاری لەدەستەگەری خۆی دەدا لە95%ی کادیرە ژیرەکان. ئەوانەی بەدەستەگەریش فریو درابوون، یان هیوای ئەندامەتی سەرکردایەتییان خرابووە دڵودەروونیانەوە، زۆربەیان پەشیمان بوونەو ئەنگوستی پەشیمانی دەکرۆژن!

پێنجەم: باش نەناسران یان خۆنەناساندنی چەند کادرێکی خەباتگێڕی لێهاتووی ژنان یان هەندێکیان هێشتا مابوویان بناسرێن.

شەشەم: هۆیەکیتریش کزی هۆشیاریو کەمی کەفائەتی خۆپاڵێوراوەکان بوو، کۆنگرە لێوەشاوەیی پێویستی لەزۆربەیان نەدەدیت. بۆ دیکۆریش دەنگیان بۆ نەدەدان.

هەفتەم: هێشتا پەیدانەبوونی کادری شایستەو هۆشیارو بەتوانا لەناو خوشکاندا کەبتوانن بەئەرکی سەرکردایەتی هەڵسنو بەزاناییو توانـاییو لێوەشاوەیی خۆیان دەنگ لەبەشداربووانی کۆنگرەکە بپچڕن.

ئا لێرەدا پێویستە، بگرە هەقو راستو رەواشە، رەخنەو گلەیی لەسەرکردایەتی ی.ن.ک بکەین لەسەر ئەوەی هەوڵی تەواو و تایبەتییان نەداوە بۆ پەروەردەکردنی کادری ژنان بۆ سەرکردایەتی ی.ن.ک.

ئەم رەخنەیە هەر لەنووسەری ئەم وتارە دەگرێتەوە تا سەر هەموو هەڤالانی سەرکردایەتیو لێپرسراوانی مەکتەبەکانو مەڵبەندەکان. هەر بەڕاستی دەبووایە سەرکردایەتی ی.ن.ک هەوڵی پەروەردەی ژنانی بۆ سەرکردایەتی دابا، نەدەبووا بەجێیً هێڵابا لەبۆ گەشەکردنی عەفەوی خۆیان.

پێم وایە ئەمەیە رەخنەو گلەیی راستو رەوا لەپیاوانی سەرکردە، کەپێویستە لەمەودوا بەجیددی نەیهێڵنو چارەی بکەن، ئەویش بەهەڵبژاردنی کادری لێهاتووی ژنان بۆ دەورەی تایبەتی فێرکردنو راهێنانو هۆشیارکردنەوەیان بۆ ئەوەی ببنە شایستەی ئەندامەتی ک.س.

هەر بـۆیەش دەبـووایە لەجیـاتی تۆمەتـدانەپاڵ ئەو کـۆنگرە زۆربـاشو سـەرکەوتووەی ی.ن.ک، رمـی رەخنەیـان بکردبـا سـەرکردایەتی ی.ن.ک نەک کـادرە ژیـرو هۆشـیارەکانی بەشـداربوو لەکۆنگرەکەدا، کەشایستەی رێزو تەقدیرن.

مـن لەوەرامـی رەخنەگرانـدا هەر یەخەی مامۆسـتا هـۆمەری شێخمووسم گـرت سـەبارەت بەوەی پیـاوێکی ژیـرو هۆشـیاری وەکـو ئەو، مامۆسـتایەکی (تحقیقـاتو دیراسـاتی عیلمـی) وەکـو ئەو نەدەبووایە لەخۆڕا ئەو تۆمەتە بخاتە ئەسـتۆی کـۆنگرەکەو چاویش بپۆشێت لەکەموکـورتی سـەرکردایەتییەکەی ی.ن.ک، چـونکە خـۆی بـاش دەزانێـت کەچەنـد هەزار کـادرێکی ژیـرو هۆشـیاری خـوار سەرکردایەتی لەناو ی.ن.ک-دا پێگەیشتوونو خۆشیان پێگەیاندووەو مایەی شانازیو دەسـتەبەری گەشـەکردنی ی.ن.ک-ن. لەوانە زۆربەی کۆنگرەکە پێک دەهاتو هەمووشیان ژیرو هۆشیارو دوژمـن بەهەمـوو جـۆرە چەوسـاندنەوەو زوڵمـوزۆری چینـایەتیو رەگەزیـو جنـسیو نیشتمانی بەدەسەڵاتی نارەوای پیاویشەوە بەسەر ژناندا.

هەنـدێ لەخوشـکان یـان نووسـەرانیتریش خۆیـان لادەدەن لەم راسـتییەی کەنـابێ پاکـانە بکرێـت بـۆ کەموکورتیـو ناتەواوییەکـانی خوشـکانو کەمتەرخەمـی کادرەکانیـان لەخـۆپەروەردەکردنو خـۆ هۆشیارکردنەوەو خۆڕاهێنان بەکاروباری سەرکردایەتی.

بـا خوشـکانی کـادیریش هەموویـان خۆیـان دوورخەنەوە لەدەسـتەگەری، بـا خەریکـی پتـر خۆهوشـیارکردنەوەو زۆرتـر خوێندنەوەو چاکترو زیاتر خۆپەروەردەکردن بن.

با داوا لەسـەرکردایەتی ی.ن.ک بـکەن کەدەورەی تایبەتییـان بـۆ بکاتەوە، تا ئیهتیمامی زۆریـان پێبـدات بـۆ پەروەردەکردنیـان بەرەو سەرکردایەتی.

با خۆشیان، هیمەت بکەن، خەبات بکەن بۆ خۆپەروەردەکردنو زیاتر هۆشیاربوونەوەو چاکتر پەروەردەی خاسیەتەکانی سەرکردایەتی لەخۆیاندا.

با خوشکان ئەم راستییە لەدڵی خۆیاندا بنەخشێنن کەهەرچەندە چەند خوشکێک شایستەی هەڵبژاردن بوون بۆ ک.س، بەڵام ئەوانیش کوێرە ڕێی دەستەگەرییان گرتە بەرو لەوێشدا هەڵدێران! خۆ هەر (11)ژنیش ژێرنەکەوتوون لەهەڵبژاردندا، بەڵکو پتر لە (50) پیاویش هەڵنەبژێردران! ئایا دەشێ بەوەش بگوترێ بەهۆی دژایەتی ژنانەوە بووە؟!

لەدواییدا دەمەوێ هەڤاڵانی خۆشەویستی وەک مامۆستا هۆمەری شێخمووس دڵنیا بکەمەوە؛ کەئێمە بەچرای گەنەگەرچەک بەدوای ژنانی ژیرو لێهاتوو و شایستەدا دەگەڕێین بۆ سەرکردایەتی ی.ن.کو بۆ وەزارەتو پۆستە گرنگەکانیش. بەڵام زوڵموزۆری سەدان ساڵەو دواکەوتەیی دێرینەی ژنانی کوردستان کەچەرخ بەدوای چەرخ بەمیرات بۆمان ماوەتەوە، بەچەند ساڵێک شوێنەوارەکانیان ناسڕێتەوە. بەڵکو ئەوە خەباتێکی دوورودرێژو هەمەلایەنەی گەرەکە هەم لەخوشکان خۆیان بەهاوکاری ی.ن.کو هەم لەسەرکردایەتی ی.ن.ک-یش بەهاوکاری خوشکان لەگەڵیان بۆ سەرخستنیان بۆ سەرکردایەتی.

هیوادارم بۆ کۆنگرەی سێیەمین چەندین خوشکی سەلارو ژیرو هۆشیار ئامادە ببنو بەزۆربەی دەنگ هەڵبژێردرێن بۆ ک.س. لەپێشەوەش پیرۆزباییان لێدەکەم!.

ژمارە (**2397**)، رۆژ (**2001/3/10**)

# ئەركی پیرۆزی ئەندامانی (ی.ن.ك)
# -نموونەبوون-

ئەركی هەرە پیرۆزی ئەندامانی (ی.ن.ك) لەم قۆناغەدا ئەمەیە، كەنموونە بن.

نموونە بن لەدڵسۆزی بۆ سەرەتاكانی سیاسیو رێكخراوەییو پێشمەرگانەو كۆمەڵایەتیو پیشەیی (ی.ن.ك). پەرۆشی سەرخستنی سیاسەتی گەشەپێدانی هەمەلایەنەی ژیانیان بێت؛ هی حزبی، هی حكومی، هی پێشمەرگانە، هی كۆمەڵایەتیو هی ئابووریش، سیاسەتی پشتبەخۆبەستنو دژایەتیكردنی مشەخۆریو سیاسەتی زەڕنەقووتەو تەمەڵیو بێباكی.

پێویستە ئەندامی (ی.ن.ك) نموونە بێت لەڕەوشتوخووی پاكو باش. لەدەستو دەمو داوێن پاكی، واتە؛ دژایەتی دزینو مشەخۆری بكات، پەرۆشی ماڵو سەروەتی گشتیو حكومی بێت.

رووی خۆش بێت، قسەی شیرینو پێسەلمێنەر بێت لەگەڵ كۆمەڵانی خەڵك، نەك بیرۆكراتو لەخۆباییو خۆسەپێن بێت.

پێویستە دەستكەوتی گشتی بخاتە هەوراز تایبەتییەوە.

لەژیانی حزبایەتیدا نموونەبوون دەكاتە گەشەبەخۆدانی ئەندام لەڕووی هۆشیاریی هەمەلایەنەوە، لەڕووی پەیڕەوكردنی پرۆگرامو سیاسەتو پەیڕەوی ناوخۆی (ی.ن.ك)ەوە، لەڕووی بەدیهێنانی

سەرەتاکانی ڕێکخستن بەتایبەتی دژایەتیکردنی دەستەگەری بەهەموو جۆرەکانییەوە؛ (دەستەگەریی سیاسی، ناوچەییو تایبەتی)و ئینجا ڕێزگرتن لە بەکۆمەڵو بەتەبایی کارکردنو بەکارهێنانی چەکی ڕەخنەلەخۆگرتنو ڕەخنەگرتن لەناو جغزی ڕێکخستنداو بەنیازی نەهێشتنی کەموکورتیو چاککردنو راستکردنەوەی هەڵەکانو گەشەپێدانی خۆشیو هەڤاڵەکانیشی، ئینجا سەرەتای کاری جەماهیریو خۆگونجاندن لەگەڵ جەماوەرو پێکەوە خەباتکردن لەگەڵیان لەپێناوی جەماوەردا.

ئەندامی (ی.ن.ک) پێویستە هەمیشە پەیڕەوی لەسیاسەتی پشتبەخۆبەستن، پشت بەخەڵک بەستن بکاتو دژی سیاسەتی مشەخۆریو زەڕنەقووتەو تەمەڵیو بێباکی بێت.

ئەندامی یەکێتی لەهەموو کارێکیدا دەبێت دڵسۆزو بەپەرۆشو گورجوگۆڵو چالاک بێت، بۆنموونە؛ ئەندامانی مەئموور لەدایەرە جیاکانی حکومەتدا دەبێت بەوپەڕی دڵسۆزیو چالاکیو پەرۆشەوە کاری وەزیفیی خۆیان ئەنجام بدەن. هیچ وەختی خۆیان بەفیڕۆنەدەن بەقسەو قسەلۆک، بەڵکو هەمیشە وەک هەنگ لەکاردا بن. ئەوەی تەمەڵی دەکات، خۆی دەدزێتەوە لەکارە سەختەکان، ئەوەی تەمەڵو بێباکە لەکارەکانیدا یان ئەوەی وەخت بەفیڕۆدەدات، ئەندامی باشو دڵسۆزو پەرۆش نییە.

نموونەیەکیتر؛ دکتۆرێکی ئەندام دەبێت بەوپەڕی پەرۆشو دڵسۆزییەوە خزمەتی نەخۆشو بریندارو کۆمەڵانی خەڵک بکات.

کرێکارێکی ئەندام لەکارگەکانی میریداو لەو کارانەی خزمەتگوزارینو یان کاری ڕێگەوبانو ئاوەدانیو کشتوکاڵن، پێویستە بەهەموو هێزو توانایەوە، بەوپەڕی دڵسۆزیو پەرۆشەوە،

بەزیرەکیو وریایی کارو وەزیفەکەی خۆی ئەنجام بدات، بێسستیو خاووخلیچی.

کادرێکی (ی.ن.ک)، پێویستە بەگیانی لەخۆبووردنو خۆنەویستییەوە، بەگیانی پەرۆشیو دڵسۆزی بۆ سەرەتاکانو دژایەتیکردنی دەستەگەریو مشەخۆریو سیاسەتی زەڕنەقووتە خەباتەکەی بەوپەڕی هۆشیاریو چالاکییەوە درێژە پێبدات.

بەکورتیو بەکوردی، پێویستە ئەندامی (ی.ن.ک) نموونە بێت لەهەموو بوارەکانی ژیانو حزبایەتیو پێشمەرگایەتیو پیشەییدا.

ژمارە (**2554**)، رۆژ (**2001/9/10**)

# پوختەی ژیاننامەی
# مامۆستا برایم ئەحمەدی نەمر

-1-

2000/4/8 لەسەعات (5)ی ئێوارە بەکاتی لەندەن- واتە 8-ی ئێوارەی لای خۆمان مامۆستا برایم ئەحمەدی رووناکبیرو ئەدیبو سیاسەتمەدارو خەباتگێڕی نەبەزماڵ ئاوایی لێکردین.

لەکاتێکدا کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەپەرۆشەوە چاوەنواڕی هێنانەوەی تەرمی ئەو رۆڵە دلێرە هوشیارەی خۆیان دەکەن بەپێویست زانرا بۆیان بەگشتیو بۆ لاوانو خوێندکارانی ئەم سەردەمە بەتایبەتی پوختەیەک لەژیاننامەی مامۆستای نەمر تۆماربکەین، تا ئەو رۆژەی رووناکبیران، ئەدیبان، خەباتگێڕان، یاساناسان، هەریەکەیان لەئاستی خۆیەوەو لەبواری خۆیدا باسو لێکۆڵینەوە لەژیانی پڕ لەبەرەکەتو بەرهەمی دەکەن.

مامۆستا برایم ئەحمەد، لەبنەماڵەیەکی کاسبکاری سلێمانی لەساڵی 1914 لەشاری هەڵمەتو قوربانی لەدایک بووە. مامە رەمزی فەتاحی مامی کەئەفسەر بووەو کوردپەروەرو پیاوێکی سەر راستو جوامێر بووە، زۆر کاری تێکردووە. هەر زوو

نـاردویەتە مەکـتەبو پاشـان پـلە بەپـلە دەسـتی گرتـووە تـا سانەوی لەبەغدا پێ تەواو کردووەو ئینجا چۆتە کـولیەی حقـوق لەبەغدا.

مامۆسـتا بـرایم لەزووەوە، هەر کەچـاوی کـردۆتەوە لەشـاری سلێمانی گوێ بیستی سرودو شیعری نیشتمانپەروەرانو تەقوتـۆقی شۆڕشـگێڕانی کوردسـتان بەسـەرۆکایەتی شـێخی نەمـر، شـێخ مەحمـوودی مەلیکـی کوردسـتانو بۆردومـانی سـلێمانی لەلایەن فرۆکەکـانی بریتانیـاوە بـووە. ئەو سـەردەمە منـاڵانی کـورد هەر لەخوێنـدنگەی سـەرەتاییەوە، چـاوکراوەو کـوردپەروەر دەبـوون. مامۆستا برایمیش جگە لەو هەلومەرجە بابەتیەی کە لەسلێمانیدا هەبوو بۆ کوردایەتیو شۆڕش، مامە رەمزیش مامۆستایەکی رێبەری بووە لەو سەردەمەی ژیانیدا.

هەربـۆیە لەسـەرەتای ژیـانییەوە، بەکـوردایەتی پەروەردە کـراوەو مێـشکی تیـژی زاخـاو دراوە بەخۆشویـستنی کوردسـتانو خەڵـکە هەژارەکەی. بۆیە لەسـانەوییەوە، لاوێکـی چـالاکی، زیرەکـی رێبـازی کوردایەتی بووە. خۆشـی وەک خوێنـدکار، زیرەکـو بەهـۆشو بزێـوو چالاک بووە. کە چۆتە بەغداش بۆ خوێنـدن، هەم لەمەکتەبەکەیـانو هەم لەدەرەوەش دۆسـتو هەڤاڵەکـانی کـوردو عەرەبـی نیـشتمانپەروەرو پێـشکەوتنخوازبوونە. هەر بـۆیەش زۆر زوو بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازیو سۆشیالیستی لەدڵو دەرونیـدا جێگیـر بـووە. لەنـاو لاوانـی کـورد لەبەغـدای ئەو سـەردەمەدا وەک لاوێکـی هەڵکەوتوو، زیرەکو بیرڕوناک دیارو ڕێزداربووە. هەر زووش دەستی هەبـووە لەشـعر ووتـن دا، کـوردی بـاش زانیـوەو خەریکـی گەشەپێدانیشی بووە.

ڕووداوی دڵتەزێنی شەشی ڕەشی ئەیلوولو هاوڕێیەتییەکەی لەگەڵ شاعیری کوردپەروەری نەمر فایق بێکەسو پاشان ناسیاویی زۆری لەگەڵ شاعیری گەورەی کوردستان گۆرانی خوالێخۆشبوو بەتایبەتی کاریان کردۆتەسەر هەستی شاعیرانەو ئەدەب پەروەرییەکەی.

دوو دۆستی نزیکی کۆییشی ئەندازیار ڕەشیدی عارف سەقای خوالێخۆشبوو لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاک سەمەدی حاجی محەمەدی مەنجەلی ڕووناکبیرو چەپو پێشکەوتنخواز دەوریان هەبووە لەنزیک کردنەوەیو بردنی بۆ یانەی بەغدا کە ئەوسا یانەی دیموکراتو چەپەکانی بەغدا بووەو لەوێدا سەرکردەکانی وەک جەعفەر ئەبولتومەنو کامیل چادرچیو عەزیز شەریفی ناسیوە، کە پاشان لەگەڵ مامۆستا عەزیزی شەریف زۆر بوونە دۆست بەتایبەتیش دوای ئەوەی ماوەی زیندانییەکەی لەبەغدا لەگەڵ شەهید عەبدولڕەحیم شەریفی برایدا بردەسەر، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی ناسیاوی خانەوادەییشیان پەیدا ببێت.

**مامۆستا برایم لەسی یەکاندا**

لەساڵانی سییەکاندا، لەهەڕەتی لاوێتیدا مامۆستا برایم ئەحمەد لەچەند چالاکییەکی کۆمەڵایەتیو ئەدەبیو سیاسیدا وەک ڕۆڵەیەکی هەڵکەوتوو، دەرکەوتووە.

لەچالاکی ناو لاواندا گروپێک پێکهاتبوو بەناوی لاوانی کوردو گۆڤارێکیشیان ناوبەناو دەردەکرد بەناوی (دیاری لاوان). لاوە چالاکەکانی ئەو سەردەمە جگە لەمامۆستا برایم، خوالێخۆشبووان شاکر فەتاحو حامید فەرەجو عزەدین فەیزیو فازل تاڵەبانی

(کەوەک براگەورەیان وابو دەردی مامۆستا برایم دەیگێڕاوە، هەم سەبارەت بەتەمەنیو هەم سەبارەت بەمیهرەبانی زۆری لەگەڵ هەمواندا)، و سابیر ئیسماعیلو سەمەد مەنجەل، هەروەک دکتۆر کاک عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵاو کاک فایق هوشیارو چەندین لاوی تری ئەو سەردەمەبوون.

لەسەر ئەو بابەتە پرۆفیسۆر (بوخارد برینتس)ی ئەڵمانی مامۆستای زانکۆی هالە لەئەڵمانیای دیموکرات لەباسێک دا کەساڵی 1964 لەگۆڤاری زانستی زانکۆی ناوبراودا بڵاوی کردەوە لەژێر ناونیشانی (دەربارەی هێندێ کێشەی مێژوویی جولانەوەی نیشتمانی کورد) دەنوسێت: (لەبەغدا ئالقەیەک لەخوێندکارانی کوردی هوشیار لەدەوری برایم ئەحمەد پێک هاتبوو کە گۆڤاری (دیاری لاوان)یان دەردەکرد. لەناویاندا دژایەتی فاشیزم بەدی دەکراو لەناو جولانەوەی نیشتمانی کوردا. برایم ئەحمەد وتاریشی دژی فاشیزم لەڕۆژنامەکانی بریتانیاوە وەردەگێڕا. برایم ئەحمەدو هەڤاڵەکانیی بیرۆکەی خەباتی یەکگرتووو یەکگرتنی کوردو عەرەب دژی ئیمپریالیزم یان بۆ یەکەم جار بڵاودەکردەوە.

برایم ئەحمەد لەساڵی 1937 نامیلکەی (کوردو عەرەب)یشی بڵاوکردەوە کەدەشێ تا ئیمرۆ بەرێبازی جولانەوەی کورد لەنێوانیدا لەگەڵ جولانەوەی رزگاری عەرەب پەسند بکرێت....... بەم جۆرە باڵێکی دیموکرات لەجولانەوەی کوردیدا هاتەکایەوە، شان بەشانی باڵی کۆنەپەرستی خۆ دابڕ).

لەڕاستیدا چالاکییە هەرە دیارو گرنگەکانی مامۆستا برایم لەسییەکاندا ئەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

1–لەنـاو لاوانـی کـورددا چـالاکی سیاسـی پێـشکەوتنخوازانەو ئەدەبیی کوردپەروەرانەو هەوڵـدان بـۆ هوشـیارکردنەوەو خۆسـازدان بۆ خەبات.

2–لەبواری ئەدەبیدا بڵاوکردنەوەی شیعرە بەناوبانگەکەی یادگـارو هیوا کە بەشیرین بەهارە نـاوی دەرکـردووە بەتـایبەتی دوای ئەوەی گۆرانیبێژی دەنگ خۆشو کوردپەروەر مامۆستا تایەر تۆفیق ئـاوازی بۆ داناو بڵاوی کـردەوە تـاوای لـێهـات بـووە ویـردی زوبـانی لاوانو مەجلـیس خۆشـکەرو کـۆڕگەرمکەری نیـشتمانپەروەرانیش. لەو شـیعرەدا دیـدی مامۆسـتا بـرایم بـۆ ژیـان بەچـاکی دەردەکەوێ کەدەڵێ:

ژیان بەلاتیو بێدەسەڵاتی هیچ درۆی نەبێ سەد مەرگەساتی
مرۆڤ بەدیلی بژی خۆشە یان بمرێ بۆ بەرزی گەلو وڵاتی
مەژی بۆ مردن بمرە بۆ ژیان چۆن قازانج ئەکەی تا نەکەی زیان
لەزررەی زنجیر دڵت نەلەرزێ پێوەند بۆ لەشە نەوەک بۆ گیان

جـگە لەم شـیعرەش دۆسـتایەتییەکی زۆر پـتەوی هەبـووە لەگەڵ شاعیری نەمرو کوردپەروەری دێرین فایق بێکەسو شاعیری گەورەی سەردەمەکەمان گۆرانی نەمرو زۆر لەئەدیبانیتریش.

3–دژایەتـی فاشـیزمو بڵاوکـردنەوەی وتـار لەدژیـا. بەتـایبەتی کە خۆی فێـری ئینگلیـزیش کردبـو وتـاری لەگۆڤـارێکی حزبـی شـیوعی بریتانییەوە وەردەگێـڕا کە سـەرکردەی ناسـراوی حـزبەکە پـالم دات دەری دەکرد.

4–بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی برایەتیو یەکێتـی تێکۆشـانی کـوردو عەرەب، دوژمنـایەتی شـەڕو ئیـستعمارو برایەتـی گەلان کە خـۆی

لەنـامیلکەکەی (کـوردو عەرەب دا) دەنوێنێـت: هەر پێـشەکییەکەی زۆربەی ئەو بیروڕایەی تێدا بەدی دەکرێت؛

پێشکەشە بە

لایەنگرانی گەلانی ژێردەست لەخەباتی رزگاریخوازانەیان‌دا

دوژمنـــانی شـــەڕو ئیـــستعمارو دۆســـتانی ئاشـــتیو دیموکراســـی ئەوانەی هەوڵدەدەن برایەتی لەنێو گەلاندا بچەسپێنن لەشوێن قـینو ناحەزی یەکترکردن.

بـــۆ یاریـــدەدەرانی گەلانـــی بـــن دەســـتو چیـــنە چەوســـاوەکان لەڕۆژهەڵاتو رۆژاوادا

لایەنگرانـــی بیـــروڕای بەرەی گەلانـــی رۆژهەڵاتـــی کە ملـــی رێـــگەی رزگارییان گرتۆتەبەر.

ئەوانەی لەکاروانی مرۆڤایەتیدا دەڕۆن

بۆ گەلی نەجیبی عەرەب.

جـگە لەپێـشەکییەکە لەدوا لاپەڕی نـامیلکەکەی بنچیـنەی زێـڕین کە لەســـەریا نێـــوانی گەلـــی کـــوردو عەرەبو گەلانـــی تـــری دونیـــا دابڕێژێت بەمافی چارەی خۆنوسین دادەنیو دەنووسی:

(ئەو بنـاغە سـەرەکییەی کە پێویـستە نێـوانی نەک هەر هەردوو گەلــی کــوردو عەرەب، بەڵکــو هەمــو گەلانــی ســەر روی زەمینیــان لەسەر دابڕێژرێت، ئەوەی کە بەبێ خۆی، نە ئاشـتی جیهـانی دابـین دەبێتو نە برایەتیو هاوکاری گەلان دەستەبەر دەکەین بەڵکو دەبـنە گوتەی هیچوپوچی بۆش)، ئەمەیە: سـەلماندنی مـافی هەر گەلێـکو داننــان بەمــافی یەکتــری لەســەربەخۆیی تەواوی راســتەقینەدا، هەر یەکەیــان لەچوارچێــوەی ســنووری تەبیعــی خۆیــدا، و ســەلماندنی ســەروەریو دەســەڵاتی تەواویــان بەســەر هەمــو کاروبــاری تــایبەتیو

گشتی خۆیاندا وەڕێکخستنی نێوانی گەلان ڕێکخستنێکی بەئـارەزوو کە نیازەکەی هاوکاریـان بێـت لەهەمـوو ئەو شـتانەی خێـرو خۆشـی مرۆڤایەتی تیا بێت) لەو نامیلکەیەشدا زۆر باسی برایەتی مێژووینـی کوردو عەرەبی کردووەو دژی شـۆڤێنیزم دواوەو داوای لەهوشـیارانی کـوردو عەرەب کـردوە کە پـێکەوە بچـنەوە بەگژیـان داو کـۆمەڵانی خەڵک بەگیانی برایەتی پەروەردە بکەنو دەشڵێ:

(لەدواییــدا هەردوو گەلــی کــوردو عەرەب بانــگ دەکەیــن بــۆ هاوکــاریو برایەتــیو پــێکەوە خەبــاتکردن لەدژی ئیــستعمارو چەوسـاندنەوە، چـونکە هەردووکیـان هەڤـاڵی یەکتـرن بەڕێبـازیی ڕزگاریدا).

لەسەر ئەو نـامیلکەیەش مامۆسـتا بـرایم درایە مەحـکەمەو میـری ویستی بەگرتنی بدات. بەڵام حـاکم دوای گـوێگـرتن لەدیفـاعەکەیو خوێندنەوەی نامیلکەکەی بڕیاری تەبریەکردنی دا.

ناوەڕۆکی ئەو نـامیلکەیە لەسـەردەمی خۆیـدا ئەهمیەتێکـی زۆری هەبوو، هەر بـۆیەش هەڵلایەکـی زۆری نـایەوە. بەڵام زۆریـش کـاری باشی هەبوو بەسەر خوێندەوارو تێکۆشەرانی کوردو عەرەبدا.

سەرەڕای ئەم شتانەی سەرەوە لەساڵی 1939دا مامۆسـتا بـرایم بڕیاری دەرکردنی گۆڤاری گەلاوێژی داوە.

-2-

**مامۆستا برایمو گەلاوێژ**

ساڵی 1939 مامۆسـتا بـرایم ئیمتیـازی گۆڤـارێکی کـۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، هوشیاری وەرگرت بەناوی (گەلاوێژ)ەوە.

لەڕاستیدا خۆی داینەمۆی گۆڤارەکە بوو، لەسەرەتادا زۆری وتارەکانی یان نووسین یان وەرگێڕانی خۆی بوو، یان وتاری لەناسیاوو دۆستانی داوا دەکرد.

ورده ورده گەلاوێژ بوو بەگۆڤاری خوێندەوارانی کوردو لەهەموو کوردستانی عیراقو ئێراندا ناوی دەرکردو نووسەری ئەو سەردەمەش روویان تێکردو شاعیرەکانیش شیعریان بۆ دەنارد.

ڕێبازی گەلاوێژ مامۆستا برایم دیاری کردبوو، کە ڕێبازێکی دیموکراتیکو کوردانە بوو. زۆر باسی مێژووی کوردستانو زمانی کوردیو شیعرو ئەدەبیاتی کوردی تیا دەکرا. لەبەشەکانی تریشدا باسی ئەوتۆی تیا بڵاودەکرایەوە کە پشتیوانی لەدیموکراسیو مافی گەلان دەکردو دژی فاشیزمو کۆنەپەرستیش بوو.

مامۆستا برایم چەندین شاکاری خۆی لەگەلاوێژدا بڵاوکردۆتەوە. شان بەشانی چەندین چیرۆکی زۆر نایاب کە زۆربەیان ریسواکردنی میریو دەرەبەگایەتیو داگیرکەران بووەو (2-3)دانەشی لەسەر نیشتمانپەروەریو وڵات پارێزی بووە. خازێ ریسواکردنی دەرەبەگو ئەفسەرێکی سیاسی ئینگلیزە. کەرەلۆتی مەنوچەر ریسواکردنی میریو دامو دەزگاکانیەتی. لەوڵاتی قارەمانانندا، باس لەخۆڕاگریو گیانی نیشتمانپەروەریو قارەمانێتی سۆڤێتیەکان دەکا، لەشەڕە رەوایەکەیاندا دژی فاشیزم.

گەلاوێژ لەڕاستیدا خوێندنگایەکی هوشیاری، کوردایەتی، زمانەوانی، پەروەردەی نووسەری کوردو بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازو دیموکراتیک بوو، بژارکردنی زمانی کوردی لەوشە زۆرو زەوەندەکانی بێگانەو داڕێژتنی شێوازێکی نوێی نووسینو

زمانی کوردی یەکێک لەشاکارەکانی گەلاوێژ بوو. ئەم کوردییەی ئیمڕۆ بۆتە زمانی نووسینو پەخشانو شیعرو چیرۆک بنجو بنەوانەکەی لەگەلاوێژدا دەبیندرێن.

لەگەلاوێژدا خەباتی گەلان بەگشتیو خەباتی گەلی چین بەتایبەتی ئیهتیمامیان پێدراوە. سەبارەت بەوەی هەر زوو مامۆستا برایم ئەهمیەتی خەباتی چینو سەرکەوتنەکەی دەزانی.

کە مامۆستا برایم ناچار کرا پۆستی حاکمی قبوڵ بکات دیسان هەر وازی نەهێنا لەگەلاوێژ پاشان دوای چەندین ساڵ کە داوای لێ کرا واز لەگەلاوێژ بێنێت، ئەو دیسان گەلاوێژی هەڵبژاردو وازی لەحاکمی هێنا.

هەرچەندە لێرەدا باسەکەمان بۆ هەڵسەنگاندو قرساندنی گەلاوێژو دەورە گرنگە مێژووییەکەی نییە، بەڵام بەکورتی جگە لەوەی لەسەرەوە ووتومانە، ئەتوانین بڵێین کە چاکترینو تەمەندرێژترین گۆڤاری رووناکبیری کوردی بووە لەچەرخی بیستەمدا.

گەلاوێژیش دوای حەپس کردنو حوکمدانی خاوەنەکەی (مامۆستا برایم) ئەویش ئاوا بوو، بەئەمری داخستنی لەلایەن میریەوە.

بۆیە بەگەلاوێژ دەستمان کرد بەباسی خەباتی مامۆستاو ژیانی ئەدەبی خۆی لەچلەکاندا چونکە بەشێکی گرنگی لەگەلاوێژدا خۆی دەنواند، بەڵام لایەنە گرنگە سیاسیەکەی خەباتی مامۆستا برایم، ئەندامەتیەکەی بوو لەکۆمەڵەی ژ.ک کە پاشان بووە بەحزبی دیموکراتی کوردستان.

**مامۆستا برایمو ژ.ک**

مامۆستا برایم دامەزرێنەرو لێپرسراوی ژ.ک/ بوو (حدک) لەکوردستانی عیراق. مامۆستا برایم بەهاوکاری چەندین تێکۆشەری تر لقەکەیان پێکهێنابوو.

مامۆستا برایم بیرو بۆچوونی کوردستانی بوو، بۆیە بەشداری حزبە کوردییە عیراقییەکانی نەدەکرد. هەرچەندە دۆستایەتیو ناسیاویشی هەبوو لەگەڵ رزگاریو شۆڕشو پارتیشدا. تەنانەت مامۆستا برایم بەیانی دامەزراندنی پارتی کە مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا بەعەرەبی نووسیبویو ژەنەڕاڵ بارزانی ئیمزای کردبوو، کردووە بەکوردیو هەر ئەویش ووشەی (پارتی) لەجیاتی حزب بەکارهێناوە کە پاشان بوو بەنازناوی پارتی دیموکراتی کورد (و پاشان کوردستان)ی عیراق.

مامۆستا برایمو هەڤاڵەکانی توانیبویان لەزۆر شوێنی کوردستان لقی بەهێز بۆ ژ.ک وپاشان بۆ حدک دروست بکەن بەتایبەتی لەسلێمانیو کەرکووک. پێم وایە بۆ یەکەمین جار خانمێک بەناوی زەکیە بابان-یشیان لەسەرکردایەتیدا هەبوو.

نێوانی مامۆستا برایم لەگەڵ شەهیدی نەمر قازی محەمەد زۆر خۆش بووە. نامەیان لەنێواندا ئاڵوگۆر کراوە. پێشەوا لەجیاتی بلە بەمامۆستا برایمی گوتووە (بیلە)- واتە بیلبیلەی چاو. دوای هەڵواسینی پێشەوا قازی محەمەدیش مامۆستا برایم شیعرێکی کورتو پوختی نایابی بۆ وتووە بەناوی شینی پێشەوا. وەبەشێوە قانونزانییەکەی خۆی پێشەکییەکی وای بۆ نووسیبوو بڵاوکردنەوەکەی حەڵاڵ بکات. لەو شیعرەدا باس لەوە دەکا کەقازی نەمر هەر لەشەکەی دەنێژرێت نەک گیانی کەهەر زیندووە.

هەرچەندە مامۆستا برایم بۆ یەکەمین کۆنگرەی پارتی بانگ کرابوو، ئامادەشی بوو بوو، بەڵام نەیسەلماند بچێتە ناو پارتیو لقی (ژ.ک)هەڵ وەشێنێتەوە، وەتا کۆماری مەهاباد تێکچو وحزبی دیموکراتی کوردستان بڵاوەی لێکرد هەرمانەوە پاشان کۆبونەوەیەکیان کرد بەزۆرینەی یەک دەنگ چوونە ناو پارتییەوە. بەڵام هەندێکیان چونە ناو حشعەوە.

ئەوسا مامۆستا برایم کرا بەسەرۆکی لقی سلێمانی پارتی چونکە نەدەکرا بکرێت بەئەندامی ک.ن.

ئەوەی راست بێت هەتا ژیا مامۆستا برایم لەدڵی خۆیدا خەباتگێڕی کوردستانی بوو. زۆریش پەرۆشی خەباتی بەشەکانی تری کوردستان بوو. چالاکییەکانی دە ساڵی دوایی تەمەنی خۆشی هەموو بۆ چالاکی کوردستانی تەرخان کردبوو.

دوای ئەوەی مامۆستا برایم بەسەرۆکی لقی سلێمانی پارتی هەڵبژێردرا گورو تەوژمێکی تری بەچالاکی پارتی داو لەچالاکییە جیاجیاکاندا بەشداری هوشیارانەی دەکرد. بەڵام زۆری نەخایاند راپەڕینی 1948 رویداو پاشان میری عیراق بەبۆنەی شەڕی فەلەستینەوە حوکمی عورفی ئیعلان کردو بەربونە گیانی خەباتگێڕانی کوردو عەرەب لەوانەش مامۆستا برایم ئەحمەد.

مامۆستا برایم لەگەڵ خوالێخۆشبووان پارێزەر جەلیل هوشیاری برای خوالێخۆشبو کاک عەونی یوسفو شەهید عەبدولڕەحیم شەریفی برای خوالێخۆشبوو عەزیز شەریف، ماوەی زیندانییەکەی لەزیندانی بەغدا بەسەر بردووە. زۆرتر خەریکی خوێندنەوەو ئینگلیزی گەشەپێدان بووە. لەزیندانیشەوە دۆستایەکی باشی لەگەڵ

مامۆستا عەزیز شەریف دروست کردووە بەهۆی (ام عصام)ی خێزانیەوەو کچەکەیەوە کە سەردانی زیندانیان دەکرد.

هەر لەو سەردانانەشدا خێزانەکانیشیان بوون بەناسیاوو تێکەڵاوی خانەوادەگیشیان پەیدا کرد.

مامۆستا برایم لەزیندان فورسەتی هێنابوو، هەندێ لەکتێبەکانی لینینی خوێندبۆوەو زۆر بەئیعجابەوە باسی نامیلکەکەی (چەپڕەوی کۆمۆنیزم سەرلێشێوانی زارۆکانە)ی دەکرد.

-3-

**مامۆستا برایم بەسکرتێری پارتی هەڵبژێردرا**

لەشوباتی 1951دا لەماڵی شەهید عەلی حەمدی بەرواری لەبەغدا کۆنگرەی دووەمی پارتی دیموکراتی کورد-عیراق گیرا. مامۆستا برایمی نەمرو خوالێخۆشبوو جەلیل هوشیار تازە پێکەوە بەرەڵلا کرابوون.

لەو کۆنگرەیەدا ناکۆکییەکی توند هەبوو لەنێوان باڵەکانی هاوبیر لەگەڵ خوالێخۆشبوو مامۆستا هەمزە عەبدوڵلاو باڵی کاک صاڵح روشدی. باڵێکی تریش هەبوو کە لەگەڵ هیچ لایەکیان نەبوون بەڵکو هەر پەرۆشی یەکێتی ناوپارتییان بوو کەبریتیبوون لەخوالێخۆشبووان کاک عومەر مستەفا دەبابەو کاک عەونی یوسف کاک عەلی حەمدی بەرواریو هەروەها کاک عەلی عەبدوڵلا.

مامۆستا برایم جێگەی موتمانەو جێی باوەڕی هەمولایەک بوو، بۆیە توانی زۆربەی زۆری پارتییەکان یەکبخاتو جگە لەکاک صاڵح روشدیو (2-3) کادری تر لەگەڵی کەجیا بوونەوە لەپارتی هەموو

ئەندامانی کۆنگرە کە بەگشتی دەنگ مامۆستا برایمیان هەڵبژارد بەسکرتێری گشتی پارتی. لەگەڵ مامۆستا برایم-یش خوالێخۆشبووان نوری شاوەیسو حەمەدەمین مەعرووفو جەلیل هوشیار، هەروەها کەمال بەکر ئیسماعیل هەڵبژێردران بەئەندامی (ک.ن)، لەسەر پێشنیاری مامۆستا برایم کۆنگرە ناوی پارتی کردە پارتی دیموکراتی کوردستان-عیراقو بەرنامەی پێشوی بەلاوە ناو بڕیاریدا (ک.ن)ی نوێ ئەرکی دارێژتنی پرۆژەی پرۆگرامێکی نوێی پێشکەوتنخوازترو چەپترو پەیڕەوێکی نوێی پارتی بگرێتە ئەستۆ.

لەو گۆنگرەیەدا مامۆستا برایم وەک سەرکردەیەکی هوشیاری زیرەکو لێهاتوو کەوتە بەردڵی هەردوو باڵە سەرەکییەکەی هاوبیر لەگەل مامۆستا هەمزەو باڵە بێلایەنە یەکێتیخوازەکەی ناو پارتیش. هەموولایەک بەڵێنی هاوکاری تەواویان پێدا ئەویش هەر زوو دەست بەکاربوو. زووبەپارەی خۆی کە لەدەعوایەکی محاماتدا دەستی کەوتبوو- چونکە محامییەکی زۆر ناودارو بەتوانابوو رۆنیۆیەکو تاپیێکی بۆ پارتی کڕی. پێش دەرکردنەوەی (رزگاری)یش کە ئۆرگانی پارتی بوو، ئامۆژگاری بەسەر لقو لژنەکاندا بڵاوکردەوە بۆ خۆ رێکخستنەوەو گەشەپێدان. چەند بەیاننامەیەکیشی بڵاوکردەوە لەسەر نەورۆزو یەکی ئایارو بێلایەنیو شەهیدانی حوزەیرانو هتد. بەڵام لەهاوینی ساڵی 1951دا مامۆستا برایم نەفیکرایەوە لەسلێمانییەوەبۆ کەرکوک. لەوێش بەیارمەتیو فیداکاری شەهید عەلی حەمدی بەرواریو خوالێخۆشبوو تێکۆشەری گومناو میرزافەندی عەبدولکەریم دامودەزگای چاپەمەنی پارتی دانایەوەو کەوتنەوە دەرچواندنی رزگاریی بەکوردیو وەک گۆڤارێکی چەپی پێشکەوتنخواز کە ئەوێ رۆژێ بەدڵی تێکۆشەرانی پارتیو

کەسانی تێکۆشەر بوو. بەڕاستی ئەو بەیانو گۆڤارە کاری خۆیان زۆر باش کردە سەر بوژاندنەوەی رێکخستنەکانی پارتیو گەشەپێدانی پارتی، هەروەک ئەو رێبازە تازەیەی پارتی بووە هۆی نزیک بوونە لەحزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانو پێشوازیکردن لەوەفدێکیانو نێوان جۆشدان لەگەڵیان. لەناوعیراقیش لەگەڵ (حزب وحده الشیوعیین) بەسەرۆکایەتی مامۆستای نەمر عەزیز شەریف نێوانی چاکو هاوخەبات دروست کرا. سەبارەت بەوەی کە ناملکە نایابەکەی مامۆستا عەزیز دەربارەی مەسەلەی کورد دەرچوبوو ولەهەمان کاتیشدا مامۆستا برایم لەزیندانەوە بەهۆی شەهید عەبدولڕەحیمی برایەوە دۆستایەتی لەگەڵ مامۆستا عەزیز پەیداکردبوو. کە لەزیندانیش هاتبووە دەر بەنهێنی سەردانێکی مامۆستا عەزیزی کردبو کە ئەوسا لەبەغدا ڤەشارتی بوو. هەروەک مامۆستا برایم سەردانی مامۆستای گەورەو رێبەری دیموکراسی لەعیراقدا کامیل چادرچی کردبوو، وبناغەی نێوانی پارتیو حزبی نیشتمانی دیموکراتی دانابوو لەگەڵیا. مامۆستا برایم لایەنگری هاوخەباتیش بوو لەگەڵ حزبی شیوعی عیراقی بەتایبەتی کە لەسەردەمی رێبەرایەتی مامۆستا بەهائەدین نووری (باسم)دا حشع دانی بەمافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلی کورد دانابوو وەسیاسەتێکی نوێی گرتبووەبەرو داوای جەمهوریەتی دیموکراتی گەلی کرد کە ئەوە دروشمی مامۆستا برایمیش بوو وپاشان لەپرۆگرامی پارتیشدا جێیکردەوە.

لەو سەردەمەدا مامۆستا برایم زۆر خەمی کوردستانی باکووری بوو، هەندێ خوێندکاری پارتی بەئەمری ئەو تەشویق کران بچنە تورکیە بۆ خوێندن بەهیوای ئەوەی کەسانێکی کورد پەروەرو چەپ

بدۆزنەوەو هەوڵیان لەگەڵ بدرێت بەڵکو دەبنە هەوێنی ڕێکخراوی کوردانە.

هەر لەو سەردەمەشداکە مامۆستا برایم سکرتێری پارتی بوو، پێشوازیلەشەهید قاسملوکردو نێوانی پارتیو حدکای لەگەڵ خۆشکردو جۆرێک هاوکاری پەیدابوو لەنێوانیاندا.

مامۆستا برایم لەماوەی ساڵێکو نیودا توانی پارتی بەرەو کرێکارانو جوتیارانو ڕەنجدەران ڕێنوێنی بکات، هەروەک توانی پرۆژەی پرۆگرامو پەیڕەوێکی نوێی زۆر چەپی شۆڕشگێڕ گەڵاڵە بکاتو کۆنگریسی سیەمینیش بەڕێبەری خۆی لەکەرکووک لەکانوونی دووی 1953 (26–27) کانوون ببەسترێتو پرۆگرامو پەیڕەوەکەی خرایە بەردەمو پەسەندکران. بەم جۆرە مامۆستا برایم پارتی گۆڕی، گۆڕینێکی نەوعی (چۆنایەتی)و کردیە پارتییەکی پێشڕەوی شۆڕشگێڕ کە کەڵک لە م.ل وەردەگرێتو حزبی کرێکارانو جوتیارانو ڕەنجدەرانی بیرو کاسبکاران بێتو دروشمی مافی چارەی خۆنوسینو جەمهوری دیموکراتی گەلی عیراقو کوردستانی پێ هەڵگرتو داوای لەڕەگوڕیشە هەڵکەندنی دەرەبەگایەتیو دابەش کردنی زەویو چاک کردنی کشتوکاڵ بووە ئامانجێکی پارتیو مافی ژنانو وەک یەکیان خرایە پرۆگرامەوە. سەرەڕای ئەوانەش مامۆستا برایم لەکۆنگرەکەدا پێشنیاری دامەزراندنی ی.قوتابیانی کوردستانو یەکێتی لاوانو یەکێتی ژنانی کوردستانی پێشنیارەکانیش پەسەندکرانو پاشان بەڕێنوێنی خۆی هەرسێکیان پێک هێندران. واتە (ی.ق.ک)و (ی.لاوانی دیموکراتی.ک)و (یەکێتی. ئا. کوردستان).

پارتی بەڕێنوێنی مامۆستا برایمی نەمر هاتە جۆشو خرۆش لەخەباتی چینایەتیو نەتەوایەتیدا. مامۆستا برایم کەسەرپەرشتی مەکتەبێکی محاماتی دەکرد کە رۆڵەی قارەمانی گەلەکەمان کاکە دەبابەشی تیابوو، بەکردەوەش دیفاعیان لەجوتیارانی کوردستان دەکرد. هەر لەپشدەرەوە تاکو بیتوێنو دەشتی شارەزوورو شاربازێڕو سورداش مامۆستا برایمو محامییەکانی هاوکاری پارێزەری جوتیاران بوون لەدەعواکانیاندا دژی دەرەبەگەکانو ئاغاو بەگەکان. تەنانەت بێگوێدان بەخەتەری سەر ژیانی خۆشی. ئەوەبوو لەساڵی 1954دا، بەکرێگیراوی ئاغایەک لەسەر دیفاع کردنی لەزۆر لێکراوان تەقەی لێکردو بەخەستی بریندار کرد، کە ئەوەش بووە هۆی ناڕەزاییەکی زۆری خەڵکی سلێمانیو تێکۆشەرانی کوردو خوێندکارانی کورد لەکولیەکانی بەغدادا.

دەربارەی چالاکییەکانی تری مامۆستا برایم، هی حزبیو نیشتمانیو چالاکی ئاشتیخوازانەو هەوڵەکانی بۆ پەرەپێدانی پارتیو بەشداری لەهەڵبژاردنی پەرلەمانو هەوڵدان بۆ پەیوەندیکردن بەسەرۆک جەمال عەبدولناسرو چینو سۆڤیەتەوە، بۆ وتاری داهاتوو بەجێی دێڵین.

پارتی بەڕێنوێنی مامۆستا برایمی نەمر هاتە جۆشو خرۆش لەخەباتی چینایەتیو نەتەوایەتیدا. مامۆستا برایم کەسەرپەرشتی مەکتەبێکی محاماتی دەکرد کە رۆڵەی قارەمانی گەلەکەمان کاکە دەبابەشی تیابوو، بەکردەوەش دیفاعیان لەجوتیارانی کوردستان دەکرد. هەر لەپشدەرەوە تاکو بیتوێنو دەشتی شارەزوورو شاربازێڕو سورداش مامۆستا برایمو محامییەکانی هاوکاری پارێزەری جوتیاران بوون لەدەعواکانیاندا دژی دەرەبەگەکانو ئاغاو بەگەکان.

تەنانەت بێگوێدان بەخەتەری سەر ژیانی خۆشی. ئەوەبوو لەساڵی 1954دا، بەکرێگیراوی ئاغایەک لەسەر دیفاع کردنی لەزۆر لێکراوان تەقەی لێکردو بەخەستی بریندار کرد، کە ئەوەش بووە هۆی ناڕەزاییەکی زۆری خەڵکی سلێمانیو تێکۆشەرانی کوردو خوێندکارانی کورد لەکولیەکانی بەغدادا.

دەربارەی چالاکییەکانی تری مامۆستا برایم، هی حزبیو نیشتمانیو چالاکی ئاشتیخوازانەو هەوڵەکانی بۆ پەرەپێدانی پارتیو بەشداری لەهەڵبژاردنی پەرلەمانو هەوڵدان بۆ پەیوەندیکردن بەسەرۆک جەمال عەبدولناسرو چینو سۆڤیەتەوە، بۆ وتاری داهاتوو بەجێی دێڵین.

-4-

**مامۆستا برایمو چالاکییە جیاجیاکانی حزبیو نیشتمانی لەپەنجاکاندا**

لەپەنجاکاندا بەڕێبەری مامۆستا برایم پارتی هاتبووە جۆشو خرۆش لەهەموو بوارەکانی نیشتمانیو کوردستانیدا.

لەکوردستاندا جگە لەپێکهێنانی ی.ق.ک-و ی.لاوانی.د.ک-و ی.ئا.ک، چالاکی ناوجوتیارانو کرێکارانیش پەرەی سەندبوو. لەهاندانی جوتیاراندا بۆ پاراستنی بەشی خۆیان لەدێهاتەکاندا مامۆستا برایم راستەوخۆ وەک پارێزەرێکی ناسراو بەشداربوو.

لەهەڵبژاردنی ساڵی 1953دا پارتی بەڕێنوێنی مامۆستا برایم سیاسەتێکی نوێی گرتەبەر. جاران پارتی موقاتەعەی هەڵبژاردنی دەکرد. ئەمجارەیان بەپێی بۆچوونی مامۆستا برایم سیاسەتی بەشداریکردن لەهەڵبژاردندا پەیڕەوکرا ئەویش زۆرتر بەنیازی کەڵک

وەرگرتن لەحەملەی هەڵبژاردنو بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی پارتی ئینجا گەر کەسیش دەرچوو ئەوا باشتر. کۆیە مسۆگەر بوو. هەمیشە شەخسیەتی کوردپەروەرو دڵسۆزی کوردایەتی خوالێخۆشبوو کاکە زیاد ئاغای غەفووری دەردەچوو. ئەمجارەیان مامۆستا برایم بڕیاریدا کە با کاک مەسعودی مەلای گەورە هەڵبژێردرێ، سەبارەت بەوەی کەعەرەبی زانێکی باشبوو وەلێی رەچاو دەکرێ هەمیشە لەپەرلەماندا وتەبێژو موعاریزێکی دیاربێت. مامۆستا برایم دڵنیابوو کەکاکە زیادی نیشتمانپەروەری دڵسۆزی کوردایەتی دڵی ناڕەنجێز زویر نابێت بەڵکو هاوکاریش دەبێت. هەرواش دەرچوو، کەپارتی کاک مەسعودی پاڵاوت کاکە زیادی نەمریش هاوکارو هاریکاربوو. لەکۆیەش بۆ یەکەمین جار حەملەیەکی هەڵبژاردن بەکۆبونەوەو خوتبەدانو چوونە گوندان ئەنجام دراو ئەوەبوو کاک مەسعود محەمەد بوو بەنائیبی هەڵبژێردراوی کۆیەو لەدەورەی یەکەمیدا زۆرباش موعارەزەی دەکردو خوتبەی چاکی دەدا لەپەرلەماندا.

لەهەڵبژاردنی مەجلیسی بەلەدیەو لیواشدا پارتی هەربەشداری کرد. لەگۆڕەپانی نیشتمانیدا مامۆستا برایم رێنوێنی هاوخەباتی بوو لەگەڵ حزبی شیوعی لەکوردستانو لەعیراقدا. هەروەک رێنوێنی هاوخەباتیش بوو لەگەڵ (حزب وحدە الشیوعیین)ی لەمەڕ مامۆستا عەزیز شەریفو حزبی نیشتمانی دیموکراتی مامۆستا کامیل چادرچیش. ئەوەبوو لەهەڵبژاردنی ساڵی 1954دا پارتیو شیوعی پێکەوە بەشداریان لەهەڵبژاردن کرد لەسلێمانیو هەڵەبجەو کۆیەو رانیەو هەولێردا.

لەکۆڕی جـوڵانەوەی ئاشـتیخوازانی دنیـاش لەعیراقـدا مامۆسـتا برایم وەک شەخسیەتێکی ناودار چـالاک بـوو، ئەوە بـوو ئەسـتێرەی زێڕینیان پـێبەخـشی، لەهاوکـاریەکەی نێـوان حـزبە نیـشتمانیەکانی عیراقیش لەساڵی 1954دا دیسان بەڕێنوێنی مامۆستا بـرایم پـارتی بەشداری تیا کرد.

لەسـاڵی 1954دا مامۆسـتا بـرایم نێـوانی خۆشـی هەبـوو لەگەڵ هەندێ لاوی مارکسی کەلەدەرەوەی حشع بوون، وەک خوالێخۆشبوو نەژادی ئەحـمەدی عەزیـز ئاغـاو خەسـرەو تۆفیـقو سـاڵح دیـلانو کـــاکەی فەلاحو هتـــد. بەهـــۆی ئەوانیـــشەوە پەیوەنـــدیکردبوو بەخوالێخۆشبوو حەمید عوسمانی سکرتێری حزبی شیوعی عیراقـی (ئەوسا). بەم جۆرە بەینی هەردوو حزب باش بوو بوو.

لەهەمـــان کاتـــدا مامۆســـتا بـــرایم هـــاتبووە ســـەر ئەو بیـــرەی کەهەوڵێکی یەکخستنەوەی حشع (القاعده) لەگەڵ وحده الشیوعیین و حشع (رایه الشغیله)ی لەمەڕ جەمـال حەیـدەریو مامۆسـتا عەزیـز محەمەدیش بدات.

مامۆسـتا بـرایم جـوڵانەوەی شـیوعی عیراقـی بەدۆسـتی گەورەی کوردایەتی دەزانی لەڕوی مەوزوعیـیەوە. هەربـۆیەش دەیگـوت ئەبێ هەوڵدەین لەڕوی زاتیشەوە وابێـتو هاوکاریـان بـین. لەبەر ڕوونـاکی ئامۆژگارییەکـانی ئەو لیـژنەی نـاوچەی بەغـدا بەگـشتیو مـامجەلالو کاک حەبیب محەمەد کەریـم بەتـایبەتی راسـپێردران بـۆ رێکخـستنی کۆبـــوونەوەیەک لەنێـــوان نـــوێنەرانی هەر (3) لایەکە. بەتـــایبەتی کەسـەرکردایەتی شـەهید سـەلام عـادل مرونەتـی نیـشان دابـوو لەم ڕووەوە. ئەوەبـوو یەکەمـین کۆبـوونەوە لەمـاڵێکی پـارتی رێکخـرا بەبەشداری مـامجەلالو کـاک حەبیـب لە لایەنـی پـارتیەوەو شـەهید

سەلام عادل لەلایەنی حشعەوەو شەهیدان عەبدولڕەحیم شەریف لەلایەنی وحدە الشیوعیین و شەهید حەمزە سەلمان لەلایەن حشع (رایە الشغیلە)ەوە. ئەنجامەکەشی هەڵوەشانەوەی وحدە الشیوعیین و وەرگیرانیان لەناو حشعدا بوو، پاشان لەدوای ماوەیەک رایە الشغیلە-ش هەمان کاری کرد. پێمان وایە ئەوکارەش خزمەتێکی گەورەی مامۆستا برایم ئەحمەد بوو، لەبۆ یەکخستنەوەی جوڵانەوەی شیوعی لەعیراقدا.

دەربارەی چالاکیش لەمەیدانی خوێندکاران‌و لاوانی جیهاندا بەڕێنوێنی مامۆستا برایم ساڵی 1955 بۆ یەکەم جار وەفدێکی خوێندکاران‌و لاوانی کوردستان چوون بۆ بەشداریکردن لەفیستیڤاڵی لاوان‌و خوێندکارانی جیهان لە وارشۆ. کەیەکێک لەئەرکەکانی پەیوەندی کردن بوو بەسەرۆکی پارتی ژەنەراڵ بارزانی کەئەوسا لەسۆڤیەت دەژیا. ئەمەیان لەبەشێکی تایبەتیدا باس دەکەین. سەرۆکی ئەو وەفدە کە مامجەلال بوو داوەت کرا بۆ چین‌و سۆڤیەت‌و لەوێش هەوڵی خۆیدا بۆ ناساندنی کوردایەتیو پارتی بەچینییەکان‌و سۆراغکردنی بارزانیش لەسۆڤیەت.

لەساڵی 1955یشدا بەدەستپێشکەریو هەوڵی مامۆستا برایم رێککەوتنێکی سەرەتایی لەگەڵ خوالێخۆشبوو نەژادو ساڵح دیلان‌و کاکەی فەلاح‌و کاک خەسرەو تۆفیق‌و پاشان لەگەڵ مامۆستا هەمزەو باڵەکەی خۆی لەپارتیدا کەناوی (الجناح التقدمی)یان بەسەردا بڕابوو، رێککەوتنێک سازدرا بۆ فراوانکردنی پارتی‌و دروستکردنی پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان، لەوکارە گرنگەشدا دیسان مامۆستا برایم دەورێکی زۆر گرنگ‌و لەخۆبوردوانەشی بینی. هەربۆیەش بەگشتی دەنگی هەموولایەکان

بەسکرتێری گشتی پ.د.ک-یش هەڵبژێردرا. بەوجۆرە دەبینین کەمامۆستا برایم ئەحمەدی نەمر چ دەورێکی بایەخداری بینی لەیەکخستنەوەی پارتییەکانو رۆڵە چەپەکانی کوردیتردا.

لەساڵی 1954دا دوای هاتنەوە سەرکاری نوری سەعیدو دەرچواندنی قانونە کۆنەپەرستەکانی ئەو سەردەمە، مامۆستا برایم بۆ ماوەیەک خۆی شاردەوەو ملی نایە خەباتی نهێنی. پاشان کەدنیاکە هێوربۆوە هاتەوە دەر بۆ درێژەدان بەخەباتە گرنگەکەی خۆی. واتە مامۆستا برایم هەر تێکۆشەری رۆژانی خۆشیو شەرعی نەبوو، بەڵکو خەباتگێڕی نەبەزی رۆژانی سەختو ژێرزەمینیش بوو. ساڵی 1956 کە ساڵی یەکخستنەوەی پارتییەکانو پێکهێنانی پ.د.ک بوو. ساڵی دۆستایەتییەکی خەباتگێڕانەی مامۆستا برایمیش بوو لەلایەک لەگەڵ حشعو شەخسی شەهید سەلام عادلو لەلایەکیتریش لەگەڵ حزبی نیشتمانی دیموکراتیو حزبی سەربەخۆیی ناسیونالیستی عەرەبی عیراق. لەگەڵ شەهید سەلام عادلدا باسی یەکخستنەوەی شیوعییە کوردەکان لەگەڵ پ.د.ک-یش کرابوو. شەهید سەلام پێشنیازەکەی بۆ مامۆستا برایم-ی نەمرو خوالیٚخۆشبوو نەژادو مامجەلال (کەوەفدی پارتیبوون) ئەوەبوو کە:

1-هەموو شیوعییە کوردەکان ببنە ئەندام لە پ.د.ی.ک.

2-بەڵام هەموو کادرە مارکسییە کوردەکان بەوانەی ناو پارتیشەوە ببنە ئەندام لەحشعدا.

3-حشع ئامادەیە کە کەسانی وەک مامۆستا برایمو مامۆستا حەمزەش تەنانەت لە م.س-ی خۆیداو هەندێکیتریان لە (ک.م)ی خۆیدا پەسند بکات. بەڵام پارتی پیٚی وابوو کەلەجیاتی خاڵی

(2)و (3) پـــارتی وەک پـــارتیەک کــۆمیتەیەکی ســـەرکردایەتی موشتەرەک لەگەڵ حشع پێـک بهێنێت. هەرچۆنێ بـوو هەرچەنـدە ئەوە ســـەری نەگــرت بەڵام نێـــوانی هەردوولا زۆر خـــۆش بـــووو هاوکارییش لەنێوانیاندا هەبوو.

-5-

**مامۆستا برایمی نەمرو**

**پوختەی هەوڵەکانی لەگەڵ حزبە عەرەبییە ناسیونالیستەکانی عەرەب**

مامۆســتا بــرایم هەر لەســییەکانەوە، هەڵگــری ئــاڵای برایەتیــو یەکێتــی تێکۆشــانی کــوردو عەرەب بــووە. لەنــامیلکە نایاباکەیــدا کەســاڵی 1937 لەبەغــدا نوســیویەتیو بڵاویکــردۆتەوە چەنـــدین سەرەتای گرنگی نیشانداوە، وەک:

1-لەنێوان کوردو عەرەبدا ئاشتیو تەبایی هەیە نەک دوژمنایەتی.

کــورتە باســێکی مێــژووش دەکــاتو دەڵــێ لەســەرەتای فەتحــی ئیسلامییەوە تائەورۆ کوردو عەرەب چاکترین شێوەی نێوان باشییان هەبووە. ئینجا دێتە سەرباسی دەوری کورد لەگەشەپێدانی ئیسلامدا تــادەیهێنێتەوە ســەردەمی ســەلاحەدینو باســی دەکــات کەنێــوانی مێژوویی کوردو عەرەب هەربریتی نەبووە لەیارمەتیو پشتیوانی کورد بۆ عەرەب، بەڵکو عەرەبیش یارمەتی کوردیان داوە.

2-باســی خەبــاتی یەکگرتــووی کــوردو عەرەب دەکــاتو دەڵــێ: (هاوکاریو هاریکاری نێوانیان لەبەگژاچوونی دوژمنی موشـتەرەکدا، لەگەڵ یەکێتی ئامـانجو ئاواتیـان، کەهەریەکەیـان ویستویەتی گەلـی خۆی رزگاربکات لەبێگانە).

3-هیچ دوژمنـایەتیو نـاکۆکییەک لەنێوگەلانـدا نیـیە، بەڵکـو ئەوە زۆرداران‌و خوێنمژان‌و داگیرکەرانن بەناوی گەلەکانیانەوە دوژمنایەتی دروست دەکەن. جائەو گەلانە چ تورک بن، چ عەرەب بـن، چ کـورد بن، چ فارس بن، هەموویان هەر براو هاودەردن‌و دەبێ هاوخەباتیش بن لەدژی دوژمنی موشتەرەکیان.

4-لەوسەردەمەشدا برایەتـی کـوردو عەرەب هەیەو بـرایەتییەکەش سەرچاوەی یەکێتی تێکۆشانیانە. مامۆسـتا دەڵـی: (کـوردیش وەک عەرەب وڵات دابەشکراوە، ئەویش وەک عەرەبی بـرای بـۆ مافەکـانی خۆی خەبـات دەکـات، ئەویـش وەک براعەرەبەکـانی دەیەوێ کـۆت‌و زنجیری کۆیلەیی بشکێنێت‌و زمان‌و فەرهەنگی خۆی بپارێزێت. کورد هاودەردی عەرەب‌ن‌و دۆسـتیانن. هەردووکیـان لەیەک دەرد دەچێـژن‌و یەک دەرمانیـــشیان گەرەکە، (کەواتە ئـــێمە هـــاورێی رێبـــازی رزگاربوونین، دەبـا دەسـت لەدەسـت هاوکـاریو لێـکگەیـشتن گەشـە پێبدەین. بـا هەردوو گەلـی کـوردو عەرەب برایەتـی بـکەن پـێکەوەو هەمـوو هێزەکانیـان سـازدەن‌و یەکـخەن لەبەگژاچـوونی ئیـستیعمار بەهەموو شێوەو جۆرەکانیدا).

5-بناغەیەکی گەرەکـی ئەو برایەتیـو هاوخەبـاتییەش سـەلماندنی مافی چارەی خۆنووسینە بۆ یەکتری.

لەبەر تیـشکی ئەو بیروبۆچـوونە نەگۆڕەیـدا مامۆسـتا بـرایم هەوڵی داوە نێوانی حزبە کوردی‌و عەرەبیەکانیش خـۆش بکـات، هەروەک بەو بۆچـوونەوەش هەڵوێـستی راسـت‌و رەوای گرتـووە لەمەســـەلەی یەکێتـــی عەرەبدا، یەکێتـــی نەتەوەی عەرەبـــی بەبەشێک لەمافی چارەی خۆنووسـینی نەتەوەی عەرەب دانـاوە. واتە ئەو مـافە هەر هـی گەلـی عەرەبە، هەر عەرەبـیش بۆیـان

هەیە بڕیار بدەن لەسەر چۆنیەتیو شێوەی یەکێتی عەرەب. گەلەکانی تر بۆیان نیيە، فیدرال، یان کۆنفیدرال، یان تێکەڵاوبوون (اندماج) بۆ گەلی عەرەب دەستنیشان بکەن. بەڵام گەلی کورد لەدەوڵەتی عیراقدا تەنها بۆی هەیە لەدوو لاوە پەرۆشو باکی مەسەلەی یەکێتی عەرەبی بێت. 1-چەند ئەم یەکێتییە یارمەتی یان رێگەی مافە رەواکانی گەلی کورد دەدات کە ئەویش وەک گەلی عەرەب مافی چارەی خۆنووسینی خۆی هەیە بێئەوەی بێگانە جۆری بەکارهێنانەکەی بۆ دیاری بکەن؟ 2-چەندو تاکوێ ئەم یەکێتییە زیان یان قازانج بەدیموکراسی دەگەیەنێت گەر کورد لەناو ئەو ولاتەدا مایەوە؟

جا بەو بیروبۆچوونانەوە مامۆستا برایمی نەمر هەوڵی داوە تا نێوانی کورد خۆش بکات لەگەڵ حزبو لایەنە نەتەوەییەکانی عەرەب، هەر لە حزبی ئیستیقلالی عراقەوە تا سەر حزبی بەعسو تا سەر سەرۆک عەبدولناسر.

مامۆستا برایم لەساڵی 1954 بەولاوە لەگەڵ خوالێخۆشبووان مامۆستا سدیق شەنشەلو مامۆستا فائیق سامەرائی دۆستایەتیو هاتوچۆی پەیداکردبوو، ئەوانیش خوا هەقە نکوڵییان لەوە نەدەکرد کە کوردیش وەک عەرەب هەقی نەتەوایەتی خۆی هەیە. هەردووکیان یارمەتی پارتیشیان دا بۆ نێوان پەیداکردنو خۆشکردن لەگەڵ سوریەو بەعسو سەرۆک جەمال عەبدولناسر.

مامۆستا برایم خۆشی لەساڵی 1958دا چاوی کەوت بە خوالێخۆشبوو مامۆستا میشیل عەفلەقو پێکەوە باسی هاوخەباتیو هاریکاری هەردوو نەتەوەی کوردو عەرەبیان کردبوو. هەر لەهەمان ساڵیشدا دۆستایەتییەکی پتەوی لەگەڵ شەهیدی نەمر مامۆستا

فوئـاد ركـابی دروسـتكردبـوو كه ئەوسـا سـكرتێری حزبـی بەعـسی عەرەبی سۆشیالستی- عراق بوو. هەر لەهەمان ساڵیش سەرۆكایەتی وەفدی پـارتی كـرد بـۆ دیـدار لەگەڵ وەفـدێكی بەعـس كه جـگه له شەهید فوئاد، د.سەعدون حەمادی‌و خوالێخۆشـبوو عەلـی سـەعدی‌و چەندین سەركردەی بەعسی تریشی تیا بەشداربوون، كۆبوونەوە كـرا لەسـەر بەشـداری پـارتی له (جـبهه الاتحـاد الـوطنی)و مـافی كـورد لەچوارچێـوەی جەمهـوری عیراقـی‌و دواڕۆژیـش‌دا. ئەنجامەكەشـی وەلاوەنانی گیروگرفتی بەشداری پـارتی بـوو لەجەبهەكەدا. شـایانی باسه لەشەستەكانیش‌دا مامۆستا برایم دۆستایەتییەكی چاكی لەگەڵ خوالێخۆشـبووان ئەحـمەد حەسـەن بەكـرو د.عەبـدوڵلا سـەللوم سامەرائی‌و عەبدولخالق سامەرائی دروستكردبوو.

بەهۆی مامۆستا سـدیق شەنشەلیـشەوە مامۆسـتا بـرایم لەسـاڵی 1957دا بەتەمای سەردانی جەمـال عەبدولناسـری نەمربـوو، كەچـی پاسپۆرتی دەست نەكەوت. بەڵام دوای سـەركەوتنی شۆڕشـی 14ی تەمـووز مامۆسـتا بـرایم هەلـی گەڕانـدنەوەی خوالێخۆشـبوو ژەنەراڵ بارزانی قۆزتەوەو لەبەغداوە بەهـۆی سـەفارەتەكەیان‌و عەبدولـسەلام عارفەوە،

زیارەتی بارزانی بۆ لای ناسر تەرتیب داو ئەوەبوو كه خۆی چـوو لەگەڵ خوالێخۆشبووان نـوری ئەحـمەد تەهـاو شـێخ صـادق بـارزانی قارەمان‌و عوبیدوڵلای بـارزانی بەپێـی تەرتیبـاتەكه خوالێخۆشـبووان بـارزانی‌و میـر حـاج ئەحـمەدو ئەسـعەد خۆشـەویش بەمیـسردا گەڕانەوەو لەوێ چاویان بەسەرۆك عەبدولناسر كەوت.

ئەو هەوڵەی مامۆسـتا بـرایم سەریەشـەیەكی زۆری بـۆ مامۆسـتا بـرایم دروسـتكـرد لەلای خوالێخۆشـبوو ژەنەراڵ قاسـم كه خـراپ

لەمەسەلەکە گەیاندرابوو تاکو پاشان بۆی روون بۆوەو وێنەکەی خۆی بەدەست خەتی خۆی بۆ مامۆستا برایم ئەحمەد پێشکەش کردووەو دەڵێ سەبارەت بەدڵسۆزیو پەرۆشی بۆ جەمهوریەتی عیراقی نەمر.

مامۆستا برایم بەو ئومێدە هەوڵی تەرتیب دانی کۆبوونەوەی وەفدی پارتی بەسەرۆکایەتی خوالێخۆشبوو بارزانی دا لەگەڵ سەرۆک جەمال عەبدولناسر کەبناغەی هاوکاریو هاریکاری نێوان نەتەوەی کوردو نەتەوەی عەرەب دارێژن. ئەو ئاواتەی پێشتر خۆی بەتەمابوو سەفەری میسری بۆ بکات، بەڵام بەداخەوە لەوسەفەرەدا ئەوئاواتەی نەهاتە دی.

لەگەڵ بەعسیش سەبارەت بەزاڵبوونی باڵی شۆڤێنی بەسەر حزبەکەدا ئاواتەکەی دیسان نەهاتەدی کەهاوکاریو هاوخەباتی پارتیو بەعس بوو لەچوارچێوەی (جبهه الاتحاد الوطنی)و مەیدانەکانی جیاجیای هەردوو نەتەوەی عەرەبو کوردا. حزبی سەربەخۆیی عیراقیش لەدوای شۆڕشی 14-ی تەمووز روویکردە کزیو لەتبوونو پووکانەوە.

ئەوەی راست بێت هەموو عەرەبە هوشیارە نەتەوەییەکانی عیراقیش زۆر رێزی مامۆستا برایمیان دەگرتو هەمیشە وەک مامۆستایەکی خەباتو خەباتگێڕی مەزن تەماشایان دەکرد. پێم وایە بەعسییە چەپەکانو سەرکردەکانی جوڵانەوەی نەتەوەیی عەرەبیش لەعیراق وەک مامۆستا عەبدول ئیلاه نەسراوی زۆر قەدری مامۆستا برایمیان لابوو.

چاوخـشاندنەوەیەک بەبروسـکەی کـاک حـیکمەت عەلیـو کـاک نەسـراوی لەکـۆچی مامۆسـتا برایمـدا ئەو راسـتییەمان بـۆ دووپـات دەکاتەوە.

هەرچـۆنێ بێـت، راسـتییەکە ئەمەیە کەمامۆسـتا بـرایم یەکەمـین هوشـیاری کـوردپەروەرە کەهەڵگـری ئـاڵای بەهێزکردنـی برایەتیـو یەکێتیی تێکۆشانی کوردو عەرەب بـووە، لەکاتێکـدا ئەوە بەلای زۆر کەسەوە لادانو بێهوودەبووە.

-6-

**مامۆستا برایمی نەمرو**

**شۆڕشی 14ی تەمووزی 1958**

پـێش سـەرکەوتنی شۆڕشـی 14ی تەمـووز پـارتی خەریکـی هەڵگیرسـاندنی شـۆڕش بـوو لەکوردسـتان، بەهاوکـاریو هەمـاهەنگی لەگەڵ سـوریەو میـسردا. لەشـام وەفـدێکی پـارتی کەپێکهـاتبوو لەهەڤـاڵان مـامجەلالو د.کەمـال فوئـادو خـوالێخۆشـبوو مامۆسـتا زەبیحـی لەپـاییزی 1957 چاویـان بەعەقیـد عەبدولحەمیـد سـەرراج کەوتبوو، کەبەنـاوی خۆیـانەوە ئامـادەیی نیـشاندابـوو بـۆ یـارمەتی دانی هەڵگیرساندنی شۆڕش لەکوردستانی عیراقدا. لەپاشان بەهـۆی خوالێخۆشبوو مامۆستا زەبیحیـشەوە لەگەڵ کەمـالەدین رەفـعەت-ی ئەفـسەری ئـازادی میـسر قـسەکرابوو لەسـەر ئەو شۆڕشـەی پـارتی بەتەمـای هەڵگیرسـاندنی بـوو. واتە یـارمەتیو رەزامەنـدی سـوریەو میــسر دەســتەبەرکرابوو لەســەر هەڵگیرســاندنی ئەو شۆڕشــە. کەسەرکردایەتی پ.د.ی.ک لێ ئاگادارکرا پەسندیان کـردو مامۆسـتا

برایم بەلایەوە کارێکی باشو پێویست بوو، هەربۆیەش هەوڵی زیاتر کرد بۆ وەرگرتنی پاسپۆرتێک بۆسەردانی میسرو چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆک عەبدولناسر کەبەهۆی خوالێخۆشبوو مامۆستا سدیق شەنشەلەوە دابین کرابوو. کەمامۆستا برایم نەیتوانی پاسپۆرت وەربگرێت، بڕیاردرا کەشەخسیەتێکی خوێندەواری کوردپەروەری دۆست کاک م.س.خ بنێردرێت بۆ لای سەرۆک جەمال عەبدولناسری نەمر.

بەڵام رووداوەکان خێرا دەگۆڕانو گەشەیان دەکرد. لەشوباتی 1958دا بە یەکێتی میسرو سوریە (الجمهورية العربية المتحدة) پێکهێندرا. ئەوەش هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی هەژاند. خەباتی ئەفسەرە ئازادەکانی عیراقیشی جۆشداو ئەوانیش کەوتنەخۆیان بۆ کودەتایەکی سەربازی.

مامۆستا برایم ئەحمەد بەهۆی خوالێخۆشبوو فەتاح شاڵییەوە ئاگای لەجموجوڵێکیان هەبوو. بەهۆی شەخسیەتی دیاری کوردیش ئەوێ دەمێ زەعیم فوئاد عارفەوە، جارێکیان زەعیم عەبدولکەریمیشی ناسیبوو بەڵام بێدواندنو باس کردن.

کە شۆڕشی چواردەی تەمووز رویدا یەکسەر مامۆستا برایم هەم داوای کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی سەرکردایەتی کرد لەکەرکوکو هەم یارمەتیدانی سەرخستنی شۆڕشەکە. لەکۆبوونەوەی 16ی تەمووزی 1958دا کۆمیتەی ناوەندی لەسەر پێشنیاری مامۆستا برایم بەیانێکی دەرکرد کەتێیدا هاتبوو کەوا پ.د.ی.ک کەپێشڕەوی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کوردە بەڕەچاوکردنی ئەرکە مێژووییەکانی خۆی لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانی نەتەوەی کوردا بەسەربەستی رای دەگەیێ کەپەرەسەندنی هێزو توانای جوڵانەوەی

رزگاری گەلی عەرەبو سەرکەوتنیو کشاندنەوەی عیراق لەپەیمانی بەغدا کەتیرەکی ئاراستەکراوی دڵـی نەتەوەی کوردەو رزگارکردنی عیراق لەڕژێمی بۆگەنی پاشایەتیو دامەزراندنی رژێمێکی جەمهوری ئـازاد، هەمـو ئەوانە زەمینـەی ژیـانێکی پـڕ لەشـادیو خۆشـی دەڕەخسێنن بۆ دابینکردنـی ئـازادیو وەک یەکی بۆ هەردوو گەلی کـوردو عەرەب، هەربـۆیەش پـارتی بڕیاریـداوە بەهەمـو هێـزێکەوە پارێزگاری جەمهوریەتی عیراق بکـات، و دژی پلانەکـانی ئیـستعمارو پلانەکانی نۆکەرانی بوەستێت.

دوابەدوای ئەوە پـارتی بەسـەرۆکایەتی مامۆسـتا بـرایم وەفـدێکی حزبـی نـاردە بەغـدا بـۆ هەوڵـدان لەپێنـاوی چەسـپاندنی مافەکـانی گەلـی کـوردا لەدەسـتووری کاتیـداو لەهەمـان کـاتیشدا لەهەمـو شارەکانی کوردستانەوە وەفدی رێکخست بۆ ئەوەی بچنە بەغدا بـۆ پیرۆزبایی لەسەرکردەکانی شۆڕش.

مامۆسـتا بـرایمو هـاوڕێکـانی زۆریـان هەوڵـدا ئۆتۆنـۆمی بـخەنە ناودەسـتوری کـاتییەوە، بەڵام هـیچ حزبێـک لەبەشـداربووەکانی حوکمـدا لـێی نەسـەلماندن هەروەهـا سـەرکردەکانی شۆڕشـەکەش ژەنەراڵ قاسمو عەقید عـارفیش بەدڵیـان نەبوو. بەڵام توانـدرا ئەو فەقەرەیە بخـرێتە دەسـتوری کـاتییەوە کەدەیگـوت کـوردو عەرەب هاوبەشـن لە نیـشتمانداو مـافە نەتەوەییەکـانی کـورد دەسـتوورەکە دەیسەلمێنێت.

پاشان لە 27ی تەمـووزدا هەمـوو وەفـدەکانی زۆربەی شـارەکانی کوردستان بەسەرۆکایەتی مامۆستا برایم ئەحـمەد چـوونە وەزارەتـی دیفاعو بەئامادەبوونی مەجلیسی سیادەو سـەرۆکی وەزیـران ژەنەراڵ قاسـمو ئەفـسەرە ئازادەکـانیتر، مامۆسـتا بـرایم بەنـاوی گەلـی

کوردەوە، خوتبەیەکی گرنگی پێشکەش کرد. تێیدا باسی برایەتی لەمێژینەی گەلی کوردو گەلی عەرەبو هاودەردیو هاودوژمنیو یەکێتی تێکۆشانیانی کرد دژی ئیستعمارو کۆنەپەرستی. هەروەها باسی چۆنیەتی داگیرکردنو دابەشکردنی کوردستانی کرد لەدوای شەڕی جیهانی یەکەمەوەو چۆن کوردستانی عیراق (ویلایەتی موسڵ) خرایە سەرعیراق بەشەرتەکانی پاراستنی مافەکانی کوردیشەوە. هەروەک باسی ئەو زوڵموزۆرەشی کرد کەکورد چێژاویەتی لەحوکمی پاشایەتیو بۆتە هۆی هەڵگیرساندنی چەندین شۆڕش لەسلێمانیو لەبارزاندا. ئینجا باسی بەشداری کوردپەروەرانی کرد لەهەمو خەباتەکانی گەلی عیراقداو سیاسەتی پاشایەتی ریسواکرد، لەدوای پیرۆزبایی لەسەرکردایەتی شۆڕش بەناوی گەلی کوردستانەوە، داوای دیموکراسیو چەسپاندنی مافەکانی گەلی کوردستانی کردو خوتبەکەشی بەوە دوایی هێنا:

بژی جەمهوریەتی عیراقی جەمهوریەتی کوردو عەرەب.

پاشان مامۆستا برایم ئەحمەدی نەمر دەورێکی باشی دیت لەریسواکردنی پلانێکی ئیستعماریو چەندین ئاگاداری گرنگی گەیاندە سەرۆک شۆڕشەکە خوالێخۆشبوو ژەنەراڵ قاسم کەبەهۆی خوالێخۆشبوو کەمال عوسمانو لەڕێگەی خوالێخۆشبوو عاسیم حەیدەرییەوە پێی گەیشتبوو. ئەوەش بوە هۆی دروست بوونی نێوانێکی خۆشو دۆستایەتیەکی تایبەتیو ژەنەراڵ قاسم کەویستبووی بەپارەو شتیتر یارمەتی مامۆستا برایم بدا،

قبووڵی نەکردبوو، ئینجا وێنەیەکی خۆی پێشکەش کردوەو بەخەتی خۆی لەسەری نوسیوە (الی اخی الاستاذ ابراهیم احمد تقدیراً لاخلاصه للجمهوریه العراقیه الخالده) واتە (بۆ براکەم مامۆستا

برایم ئەحمەد، تەقدیرەن بۆ دڵسۆزییەکەی بۆ جەمهوریەتە نەمرەکەی عیراق). ژەنەراڵ قاسم زۆر هەوڵی دەدا کەمامۆستا برایم لەخۆی نزیک بکاتەوە. تەنانەت کەقاسم لەخوالێخۆشبوو بارزانی تۆرا لەسەر کوشتنی ئەحمەداغای زێباری ویستی بەمامۆستا برایم دەوری خوالێخۆشبوو محەمەد حەدید بگێڕێت لەناو پارتیدا بەڵام مامۆستا برایم نەک هەر رەتی کردەوەو پەکی ئەو پلانەی خست هەوڵێکی زۆریشی دا بۆ هێورکردنەوەی کۆنگرەی ئاشکرای پارتی لەدوا خوتبە توندوتیژو پڕ لەسوکایەتیکردنەکەی ژەنەراڵ بارزانی بەپارتی کەبووە هۆی چوونەدەری وەفدی کەرکوکو دەیان کەسیتر لەکۆبونەوەکە. بەڵام پاشان مامۆستا برایم کۆیکردنەوەو خاوی کردنەوەو دڵی دانەوەو بۆی روونکردنەوە کەدەبێ ئیمڕۆ لەهەمو کاتێک زیاتر لە (سەرۆک بارزانی) قبووڵبکەینو ماوەی دووبەرەکێ نەدەین.

مامۆستا برایم پێی وابوو کەشۆڕشی چواردەی تەمووز رووداوێکی گەورەو گرنگە لەعیراقدا، بەڵام لەسەرەتاوە ترسی لادان لەدیموکراسیو عیراقچیەتێکی بێتامی دژ بەعەرەبایەتی پێشکەوتنخوازیش لەدڵ خولی دەداو زۆریش ناڕازی بوو لەدابڕینی ژەنەراڵ قاسم لەوئاواتو هیوایەی کەگەلی عیراق پێیان هەبوو. بۆیە لەشیعرەکەشیا لەدوای برینداركردنی قاسم، دەیبەستێتەوە بەدیموکراسیو ئازادییو سەربەستییەوە.

زۆریش هەوڵی دا (جبهه الاتحاد الوطنی) تێکنەچێت کەپێکهاتبوو لەشیوعیو بەعسو نیشتمانی دیموکراتیو پارتیو پارتی سەربەخۆیی، چونکە پێی وابوو کەتێکچوونی عیراق بەرەو کارەسات دەبات. رووداوەکانیش دوورئەندێشی مامۆستایان

سەلماند. کەقاسمیش لای دا لەڕێگەی دیموکراسیو کەوتە دژایەتی حشعو ڕێکخراوە دیموکراتەکان زۆری پێناخۆشبوو، وەپێی وابوو ئەوە ڕێگەی پلانی چەواشە خۆش دەکات، هەرواش دەرچوو.

-7-

**مامۆستا برایمی ئەمرو**

**رۆژنامەی خەباتو کوردستانو گۆڤاری رزگاری**

هەرلەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی تەمووز مامۆستا برایم بیری لەدەرچواندنی رۆژنامەو گۆڤاری سیاسی کوردی دەکردەوە. لەسەرەتادا دوای وەرگرتنی موافەقەتی شەفەهی بۆ گۆڤارێک بیر لەدەرچواندنی رزگاری کرایەوە، کە ناوەکەشی هەر پێشنیاری مامۆستا برایم ئەحمەد بوو. لەدوای دەرچواندنی چەند ژمارەیەکی رزگاری، ماوەی دەرچواندنی رۆژنامەی سیاسیش پەیدابوو، ئەوەبوو مامۆستا برایم داوای ئیمتیازی رۆژنامەیەکی سیاسی کرد بەناوی (خەبات)ەوە کەهەر خۆی خاوەنو بەرپرسیاریشی بوو.

لەسەرەتادا خەبات بەکوردی دەردەچو بەڵام بەسەرپەرشتی دەستەیەک لەو هەڤاڵانەی کەجڵەوی (م.س)یان گرتبووە دەست. لێرەدا ماوەی باس کردنی ئەوەنییە کەچۆن بەپێچەوانەی رەئی بەشە زۆرەکەی ک.س ئەو کەسانەی سەر بەحشع بوونو داوای گۆڕینی پارتییان دەکرد تاببێتە حزبی موڵکدارو سەرمایەداری نیشتمانیی کورد کاریان درایە دەست لەلایەن سەرۆکی حزبەوە. هەربۆیەش ئەو ژمارانەی ئەوان

دەریان دەکرد ئەو جۆرە بیروڕایەی بڵاودەکردەوەو باڵۆرەی پێشڕەوی چینی کرێکاری عیراقو کوردستانی بۆ حشع لێدەدا.

بەکردەوە مامۆستا برایمیش لەسەرۆکایەتی نوسیندا بەلاوە نرابوو هەربەناو مابۆوە. تاکو راپەڕینی جەماوەری پارتیو بڕیاری هەموو لیژنە ناوچەکان بەهەڵگەڕانەوە لەوتاقمەو ناردنی وەفدیان بۆ لای سەرۆکی پارتی کەئەویش بەپیردەنگیانەوە هاتوو رۆژنامەکەی لەدەست ئەوتاقمە دەرهێنایەوەو دایەوە دەست مامۆستا برایم ی خاوەنی قانوونیو سەرنوسەری رەسمیی رۆژنامەکەو لیژنەیەکیش پێکهات بۆ سەرپەرشتی رۆژنامەکە تاکو مامۆستا برایم لەسەفەرەکەی دەگەڕایەوە، لەهەڤالان خوالێخۆشبووان حیلمی شەریفو مامۆستا زەبیحی لەگەڵ مامجەلال. کەمامۆستا برایمیش گەڕایەوە جڵەوی کارەکەی گرتەوەدەست.

لەوساوە رۆژنامەی خەبات گەڕاندرایەوە سەر رێبازی راستەقینەی پارتیو وردە وردە کرا بەرۆژانەش. زۆربەی سەروتارەکان مامۆستا برایم خۆی دەینووسی، هەروەک چاوەدێریو سەرپەرشتی هەموو بەشە گرنگەکانی رۆژنامەکەشی دەکرد. ئیتر رۆژنامەکەش دەستی کرد بەدەرچوون بەزبانی عەرەبی. لەو دەورەشیدا هەر مامۆستا برایم داینەمۆی رۆژنامەکەبوو، هەر خۆی زۆربەی زۆری سەروتارەکانی دەنوسیو وتارەکانی تریشی دەخوێندەوەو کەموزۆری لێدەگۆڕینو راستی دەکردنەوە. بۆ ئەوکارەش

رۆژانە لەبەیـــانیەوە تـــاکو ئێـــوارەیەکی درەنـــگ لەبارەگـــای رۆژنامەکە دەمایەوە.

بـۆ مـاوەیەک رۆژنـامەکە لەچاپخـانەکەی مامۆسـتا مـحەمەد مەهدی ئەلجەواهری نەمرا چـاپ دەکـراو پاشـان بـووە خـاوەنی چاپخانەی خۆشی.

پەیـداکردنی چاپخـانەکەش هەر بەدەستپێـشکەریو هیمەتـو هەوڵو کۆششی مامۆستا برایم ئەحمەدی نەمر بوو.

رۆژنـامەی خەبـات وەک رۆژنـامەیەکی رۆژانەی پـڕ تیـراژی پێـــشکەوتنخوازیی هەڵگـــری ئـــاڵای ئاشـــتیو دیموکراســـیو دوژمنـــایەتی ئیمپریـــالیزمو کۆنەپەرسـتی نـــاوی دەرکـــرد. زۆر دەنگوباســـــی وڵاتـــانی سۆشیالـــستیو خەبـــاتی گەلانـــی بڵاودەکردەوە، هەربۆیەش نـوێنەرانی بـۆ وڵاتـانی سۆشیالـستی وەک چینو سـۆڤیەتو بولگاریـاو ئەڵەمانیـای دیمـوکرات بانـگ دەکران.

پاشـــان کەپـــارتی ئیجـــازەکەی وەرگـــرت بەنـــاوی (الحـــزب الـدیموقراطی الکردسـتانی)ـەوە بڕیـاردرا مامۆسـتا بـرایم نـاوی خەبات بداتەوە بەحزب، واتە خاوەنی رۆژنامەی خەبـات پـارتی خۆیبێـــتو سەرنوسەرەکەیـــشی مامۆســـتا بـــرایم. بـــۆئەوەش مامۆستا برایم داوایەکی رەسمی پێشکەش کـرد بەمیـری داوای کـرد نـاوی خەبـات بخـرێتە سـەر رۆژنـامەی پـارتی کەبەپـێی قانوون هەقـی دەرچوانـدنی رۆژنـامەی هەبـوو، لەجیـاتی نـاوی خەبـاتیش نـاوی کوردسـتان بچێـتە شـوێنەکەی لەڕۆژنـامەکەی مامۆســـتا بـــرایم خۆیـــدا. بەوپـــێیە رۆژنـــامەی کوردســـتانیش پەیدابوو کەسەرنووسەری لێپرسراوی پارێزەر جەلال تاڵەبـانی

بـوو. دەسـتەی نوسەرانیـشی بریتیبـوون لەخـوالێخۆشـبووان زەبیحی، حیلمی شەریف، هەژار شان بەشانی مامجەلال.

لەکاتێکدا نوسەرە سـەرەکیەکانی خەبـات جـگە لەمامۆسـتا برایم بریتیبوون لە: 1-د.شـەمزینی کە ئـوتروحەی دکتـۆراکەی خۆی رۆژانە دەکردە عەرەبیو کاک خەلیلـی سـووری بەسـەریدا دەچـــۆوە، واتە ئەم دوو زاتە رۆژانە لایەکـــی لاپەڕەیەکیـــان پڕدەکردەوە، 2-مامجەلال کـــــــەوەک مـودیری بەڕێـوەبردنی رۆژنامـــــــەکە وابـوو 3-خـوالێخۆشبوو حیلمـی شـەریفـو 4-کـاک حەبیـب مـحەمەد کەریمـیش. جـگە لەوانە ناوبەنـاویش مامۆســتا جەرجــیس فەتحــوڵڵا وتــاری باشــوبەپێزی تێـدا دەنووسی.

هەروەک خــوالێخۆشــبوو زەبیحــیش دەوری خــۆی هەبــوو لەنووســینو تەرجـومەدا. خەبـات جارێکیـان درایە مەحـکەمە لەســـەر وتـــارێکی ســـەرەکی کەدەربـــارەی مـــادەی (3)ی دەستووری کاتی نووسـرابوو: لەمەحـکەمەی عورفیـدا مامۆسـتا برایم دلێرانە وەستاو هەموو ئۆباڵەکەی خستە ئەستۆی خۆیـو دیفاعێکی جوامێرانەی کرد. دەیان پارێزەری کـوردو عەرەبـیش بەتەتەوەع ببـوونە پـارێزەری. پاشـان لەسـەرکوژرانی سـدیق میران، حاکمی عورفی گشتی ئەمـری گرتنـی مامۆسـتا برایمـی دەرکـــردو ئەویـــش خـــۆی شـــاردەوەو لەدوای بڵاوکـــردنەوەی خـوتبەکەی مـامجەلالـیش لەنەورۆزی 1961دا کەزۆر دیفـاعی لەخوالێخۆشبوو بارزانی کردبوو دژی دیکتاتۆرییەت رۆژنـامەی خەبـات بەڕەسـمی داخـرا. پاشـان لەدوای شۆڕشــی ئەیلـوول بەپارتییەوە، ئیجازەیان لەغوکرا.

کوردستـــتانیش دوای ئەوە دەســتی کـرد بەدەرچـوون، بەڵام ئەویــش زۆری نەخایانــد لەلایەن میــریەوە راگیــرا. بەوجــۆرە دەبینـــین کەمامۆســـتا برایمـــی نەمـــر لەکـــۆڕی رۆژنـــامەگەری کوردیشدا بەزمانەکانی کوردیـو عەرەبـی نوسـەرێکی پێـشڕەوی هێـژاو قەڵەم تیـژو بەپیتوبڕشـت بـووە. بەڕاسـتی بـۆی هەیە بەبـاوکی رۆژنـامەگەری هوشـیاریو کەلتووریـو سیاسـیی کـورد دابنـــدرێتو دەوری زۆرو گرنگـــی لەدەرچوانـــدنی رۆژنـــامەی کوردیـــدا لەلاپەڕەیەکـــی پرشـــنگداری مێـــژووی کوردایەتیـــو فەرهەنگیو رۆژنامەگەریدا بنوسرێتەوە.

ژمارەکانی (**2117**، **2118**، **2119**، **2120**، **2121**، **2122 2123**، **2124**)،
رۆژانی (**11-12-13-15- 16- 17-18- 19**/ **4**/**2000**)

# هەندێ لەبیرەوەری یەکانم
# لەگەڵ مامۆستا برایم ئەحمەدی نەمر

**یەکەم چاوپێکەوتن**

دیارە من ناوی مامۆستا برایم ئەحمەدم بیستبوو. هەر لەدوای 2-3 ساڵ لەدەرچوونی گۆڤاری گەلاوێژەوە ناویم بیستبوو. بگرە لەدووریشەوە دیبووم. من خوێندکاری سەرەتایی بووم ئەویش بۆ چەند رۆژێک بەحاکمی نێردرابوو بۆ کۆیە. لەوێ دەعوایەکی دژی هەقەکان هەبوو. مامۆستا برایمی حاکم پشتیوانی کردبوونو تەبریەی کردبوون.

ئەوەش دەنگیدایەوە چونکە حکومەتو هەندێ لەئاغاکان دژی هەقەکان بوون. لەوساوە، لەدوورەوە، مامۆستا برایمم ناسی نەک هەروەک خاوەنی چاکترین گۆڤاری سەردەمی خۆی، بەڵکو وەک دڵسۆزێکی هەژارانو پشتیوانێکی جوتیارانو لێ قەوماوانی کوردیش. بەڵام هەم سەبارەت بەتەمەنو هەم سەبارەت بەنەبوونی هیچ موناسەبەیەک بەدیداری مامۆستا برایم شاد نەبووم تاکو ئەو ساڵەی لەزیندان ئازادکرا، ساڵی 1951. لەشوباتی ئەو ساڵەدا لەگەڵ خوالێخۆشبووان عەونی یوسفو نوری شاوەیس لە هەولێرەوە چووبووین بۆ کۆنگرەی

دووەمی پارتی دیموکراتی کورد-عیراق کە لەماڵی شەهیدی نەمر عەلی حەمدی بەرواری دەبەسترا.

ئەوسا ناکۆکییەکی توند هەبوو لەناو پارتیدا، کۆنگرێس (3)بەش بوو. ئێمەمانان: خوالێخۆشبووان حلمی عەلی شەریف، نوری شاوەیس، عەلی حەمدی بەرواری لەگەڵ بەندەو کاک مەجیدو کاک بەکرو چەند هەڤاڵێکیتر باڵی مامۆستا حەمزە عەبدوڵڵای خوالێخۆشبوو بووین. کاک سەلاح روشدیو خوالێخۆشبوو مستەفا کەریمو مەلا سەیفوڵڵا مزوریو مەلا سدیق بلوکینی باڵی کاک ساڵحو دژی کاک هەمزە بوون. مامۆستایانی خوالێخۆشبوو برایم ئەحمەدو کاکە دەبابە، جەلیل هوشیارو عەونی یوسف لەگەڵ کاک عەلی عەبدوڵڵا بێلایەن بوون. بەڵام بەپێچەوانەوەی باڵەکەی کاک ساڵح روشدی لەگەڵ پاراستنی یەکێتی پارتیدا بوونو ئامادەی خۆنەپاڵاوتنەوەش بوون بۆ سەرکردایەتی پارتی لەپێناوی ئەو یەکێتییەدا.

مامۆستا برایمو کاک جەلیل تازە لەزیندان ئازادکرابوون. بۆیە جێگەی موتمانەو رێزی هەموو باڵەکان بوون: بۆیە کەوتنە بەینەوە بۆ پاراستنی یەکێتی پارتی. ئێمەمانانی (حەمزەیی) منیان هەڵبژارد بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ مامۆستا برایم کە لەئوتێل ترۆکادیرۆ دابەزیبوو.

کاکی کاکان منی بردە لایو منی پێناساند. ئەویش زۆر بەلوتفەوە منی دواندو پێویستی پاراستنی یەکێتی ریزەکانی پارتی بۆ روون کردمەوەو تێی گەیاندم کە نابێ لەو راستایەدا مەسەلەی بەشە زۆرو کەم بێتەکایەوە. منیش ئەوەم قبووڵکرد

بەو شەرتەی نەک هەرمامۆستا حەمزە لەسەرکردایەتیدا نەبێت بەڵکو هەموو ئەندامانی پێشووی ک.م-ی تیانەبێت تاکو کۆنگرەی داهاتوو. مامۆستا برایمیش ئەو پێشنیارەی لێ قبووڵکردم بەو شەرتەی ئێمەش دەنگ بدەین بۆ کاک جەلیل هوشیار بۆ ک.م. کەگەڕامەوە لای هەڤاڵەکانی باڵی خۆمان هەموویان پەسندیان کرد بەمامۆستا حەمزەشەوە.

دیارە ئەو ڕۆژە هەموومان جگە لەکاک ساڵح ڕوشدیو تاقمەکەی مامۆستا برایم ئەحمەدمان وەک ڕزگاریهێنەر بۆ پارتیو ڕێبەرێکی شۆڕشگێڕی پێشکەوتنخواز دادەنا. هەر بۆیەش بەگشتی دەنگی کۆنگرەی دوو کرا بە سکرتێری پارتیو بۆ ک.م-یش. لەهەڵبژاردندا هەڤالان خوالێخۆشبوو نوری شاوەیسو خوالێخۆشبوو حەمەدەمین مەعروفو کاک بەکر ئیسماعیلو مامجەلال هەڵبژێردران.

دوای ئەوە مامۆستا برایم منی جیاکردەوەو گوتی ئەوە هەڤالانی ئێوە بەپێچەوانەی ڕێککەوتنەکەمان کاک جەلیل-یان هەڵنەبژاردوەو بەڵکو تۆیان هەڵبژاردوە. منیش پێم ڕاگەیاند کەمن خۆم نەپاڵاوتبوو، هەر بۆخاتری سەرخستنی ڕێککەوتنەکەش تەنازول دەکەمو دوای من کاک جەلیل دێتو دەبێتە ئەندامی ک.ن. هەرواشم کرد ئەوسا مامۆستای نەمریش ڕازیبوو.

لەیەکەم دیدارما لەگەڵ مامۆستا برایم ئەحمەدی نەمردا زۆر ئیعجابم پێی پەیداکرد. جارێ بەکوردیەکی ڕەوانی زۆرجوان، بیروباوەڕی خۆی بۆ ڕوون کردمەوەو تێیگەیاندم کەدەبێ یەکێتی پارتی بپارێزین، جارێش وەختی گۆڕینی پەیڕەوو

پرۆگرام نییە. چونکە کاری واگرنگ بەپەلەو بەسەرپێی ناکرێ. دەبێ خۆی بۆ ئامادەبکەین. پرۆژەیەکی تێروتەسەل ئامادە بکەین، بیخەینە بەردەست هەڤالان لەهەموو شانەو لیژنەکاندا بیروڕای خۆیانی لەسەربدەن، دەوڵەمەندی بکەن‌و گەشەی پێبدەن، ئینجا بهێندرێتەوە بەردەم کۆنگرەیەکی فراوانترو (شەرعیتر) لەمەی ئێستا بۆ بڕیار لێدانی.

بیروباوەڕە چەپەکانیشی سەرنجی راکێشام. مامۆستا برایم هەر لەسەرەتای ژیانییەوە، چەپ بوو، زۆریش لەژێر تەئسیری لینینیزمدا بوو، دوای ئەو بە ماوتسی تۆنگو تاقیکردنەوەی چینی موعجەب بوو. بۆ یەکەمین جار گوێم لێیبوو، پاشانیش زۆری دەگوتەوە، کە (خۆزیا مارکسیزم- لینینیزم لەڕێگەی چینەوە بۆ رۆژهەڵاتی ئێمە دەهات). ئەو بیرۆکەی خۆی باش بۆ شەرح کردم‌و پێی سەلماندم. سەبارەت بەوەی کەهەلومەرجی چین لەهی رۆژهەڵاتی ئێمە زۆر نزیکترە هەتاکو هەلومەرجی ئەوروپا. چینیش وەک ئێمە وڵاتێک بووە نیمچە سەرمایەدارو نیمچە دەرەبەگ، بن دەست‌و بێبەش لەسەربەخۆیی، ئەویش لەقۆناغی رزگاری نیشتمانیو دیموکراسیدا بوو، دیموکراسییەکەشی دیموکراسیی نوێ بوو. کەمامۆستا برایم باشی تێگەیشتبووو چاکیش لەمنی گەیاند. مامۆستا برایم دەیەویست ئەوەش بخاتە ناو پرۆگرامی پارتییەوە، واتە دیموکراسی نوێ، کەقۆناغێکە لەبەینی سەرمایەداری کلاسیکیو سۆشیالیزمدا.

مامۆستا برایم لەکۆنگرەی دووەمدا هەڵبژێردرا بەسکرتێرو بیروڕاکەشی لێپەسند کرا کە هەرتەنها ناوی حزب بگۆڕدرێتو

کرا به (پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق) پرۆگرامو پەیڕەوی کۆنیش بەلاوەنران، بەڵام بۆ هی نوێ خرایە ئەستۆی (ک.ن)ی نوێ کەئامادەی بکات بۆ کۆنگرەی سێی پارتی.

دوای تەواوبوونی کۆنگرە مامۆستا برایم لەدوی ناردمو چوومە لای لەئوتێلەکە. سوپاسی کردمو رێزی لەهەڵوێستەکەم گرتو زۆریشی پێخۆشبوو کەبۆم باس کرد بەدڵو بەگیان ئەو هەڵوێستەم هەبووە. بەتایبەتی من خۆشم بەشایستەی ئەو شوێنە نەدەزانی سەبارەت بەوەی کەئەوسا سنفی چواری سانەوی بوومو ئاستی هوشیاری سیاسیم زۆر بەرز نەبوو.

هەر لەوکۆبوونەوەیەدا رێنوێنی کردم کە (الدیمقراطیە الحدیثە)کەی مامۆستای خوالێخۆشبوو زەکی خەیری بخوێنمەوە کە بەشێکی بەعەرەبیکراوی کتێبە گۆرینەکەی ئەدگار سنو بوو بەناونیشانی (ئەستێرەیەکی سوور بەسەر چینەوە). پێی گوتم کە هەوڵدەم دیموکراسی نوێی ماویش پەیدابکەمو بیخوێنمەوە. هەروەک باسی ئەوەشی بۆ کردم کەپێویستە ئیهتیمام بە کرێکارانو جوتیارانو خوێندکاران بدەینو ئامۆژگاری کردم کەکادری جوتیاری پەروەردە بکەین بۆ لادێی دەشتی هەولێرو قەراجو بەڕانەتی. واتە سەرنجی بۆلای رەنجدەرانی بیروبازوو راکێشام.

لەوەرامی پرسیارێکی مندا باسی بۆ کردم کە ستالین لەموحازەرەیەکیا بۆ زانکۆی رەنجدەرانی رۆژهەڵات باسی (3)جۆر پارتی پێشڕەو دەکات یەکێکیان لەو ولاتانەی کە پرۆلیتاریا تیا بەژمارە هەندەو بەچۆنایەتیش خەملیوە، یەکێکیان ئەو ولاتانەی پرۆلیتاریای هەیە بەلام زۆرنییەو

تـــاقیکردنەوەی کرێکـــارانەی کەمە، یەکێکیـــان وڵاتـــانی بـــن دەســـتەی بـێ چینێکـی کرێکـاری خەمڵیـون، کەدەبـێ پـارتی پێشڕەویان (دیموکراتی شۆڕشگێڕ) بێت.

ژمارە (**2122**)، رۆژ (**2000/4/17**)

# چەند بیرەوەریەكو شەهید شیهاب

**تایبەتە بە کوردستانی نوێی خۆشەویست**

1- ساڵی 1968 شەهید شەهابم ناسی. ئەو ساڵە شەهید شەهاب خوێندکاری کولیەی مەلیک فەیسەڵ بوو لە بەغداو منیش لە پۆلی یەکی متەوەسیتەی کۆیەبووم. کولیەکەی شەهید دوای راپەڕینەکەی کانوونی دووەمی 1968 بەسترابوو، خاڵی شێخ نوری شێخ صاڵحی شاعرو کوردپەروەری باوکی شەهید شەهاب دۆستی باوکم بوو مدیرناحیەی تەقتەقیش بوو، بۆیە شەهید شەهابی ناردبووە کۆیە بۆ ماڵی ئێمە بۆ ساڵ تەواوکردن. هەر بۆیەش لە گەڵیا ئاشنابووم‌و بوینە برادەر. هەردووکیشمان ئەندامی پارتی بووین بۆیە پێکەوەش زۆر تەبابووین. لەوەساوە منو شەهید شەهاب بووین بە هەڤاڵو برادەر تەنانەت کە هەندێجار رێبازی سیاسیشمان لێک دادەبڕا ئێمە هەر دۆستو هەڤاڵ دەماینەوە. لە دەستپێکو سەرەتای برایەتیەکەمانەوە شەهید شەهابم چووبوو بەدڵاو لاوێکی خوێن گەرم، بەوەج بەگەڕوو تەوژم، ژیرو بە دەموپل بوو.

2- دوای کودەتا شومەکەی شوباتی 1963 کاک شەهابیش لەوەلاوە دڵسۆزانە کە روویان کردە ناوچەی شۆڕش شەهید ناوچەی چەمی رێزانی هەڵبژارد سەبارەت بەوەی کە دەیزانی بارەگای سەرکردایەتی هێزی رزگارییە کە بەندە فەرماندەی بووم. لە دوای لێک دابڕانی چەند ساڵە بە دیداری یەکترشادو شوکربوینەوەو کاک

شەهاب بۆ هەر کارێکمان دادەنا سەرکەوتوانە ئەنجامی دەدا، هەر لە رێبەری سیاسییەوە تاکو لێپرسراوی ئیداریو تاکو پێشمەرگایەتی ناو سەنگەرەکانی شۆڕش. لەوماوەیەدا زۆر پێکەوە دەدواینو زۆر باشتر لەیەکتر گەیشتینەوە. ئیتر بەتەواوی بووینە برای گیانی بەگیانیو هاوسەنگەرو هاوڕێی خەباتی شۆڕشگێڕانەو پێشکەوتنخوازانە. لەبیروبۆچوونو هەڵوێستەکانی سیاسیدا بە تەواوی لێک نزیکو هاوبیربوین. لەناو (پ.د.ک)دا پێکەوە هاوڕێبازبووین. لەناو نیهایەتی شەستەکانیشدا زۆرتر لێکنزیکو هاوکاربووین. پێکەوەش هاتیەنە سەر بیری دامەزراندنی مەکتەبەی (بیری نوێ) کە کاکە دارۆی برای شەهیدمان لێکرد بەخاوەنی. کەخۆیو چەند هەڤاڵێکیشی هاتبوونە سەر بیروڕای دامەزراندنی رێکخراوێکی تایبەتی (م.ل)ی هاتە لامو پرسیان پێکردمو پێکەوە بناغەی کۆمەڵەمان دارێژت.

3- شەهید شەهاب لە دارێژتنی بناغەی کۆمەڵەدا زۆر چالاک بوو. ژیرانە بەرەنگاری گیروگرفتەکان دەبۆوە. لەهەموو هاوڕێیانی ناوەوە کامڵترو ژیرتربوو. لە جورئەتو ئازایەتیو ئیقدامکردندا کەموێنەبوو. بۆیە دوای دووساڵ لە دامەزراندنی کۆمەڵە پێشنیارمکرد بۆ هاوڕێیان کە بیکەنە سکرتێری کۆمەڵە. ساڵی 1972 لە بەیروت بووم- نامەیەکم نارد بۆی تا سەردانێک بکات. نیازم ئاڵگۆڕی بیروڕاو شێوەی نوێکارکردن بوو.

نامیلکەیەکم بۆ نوسیبوون دەمەویست لەگەڵیا باسی بکەمو بیروبۆچوونەکانی ئەویشی لەسەر وەرگرم چەند مانگێک لە بەیروتو شام پێکەوەبووین. جارێکیان کاک شەهاب بو بەمایەی رزگاربوونمان لە مردن یان ئەسیرکران!

ئەویش بەمجۆرەی خوارەوە بوو:

من لە شوقەیەکی (الجبهة الشعبیة لتحریر فلسطین) دادەژیام کە لەسەر جادەی قروان بوو هی د. ودیع حدادیش بوو. وادەرکەوت کە ئیسرائیلیەکان دەمێک بوو بەتەمای پەلاماردانی ئەو کۆڵانەو شوقەکانی بوون. شەوی هێرشەکەش هەرچی لە شوقەکاندابوون یان کوژران یان گیران. منیش ئەوشەوە بە راسپاردەی کاک شەهاب نەگەڕامەوە نازانم هۆیەکەی چیبوو، بەڵام تەلەفۆنێکم بەناوی ئەوەوە بۆهات بووە هۆی نەگەڕانەوەمو نەچوونەوە بۆ ژورەکەم واتە رزگاربوونم لە مردن یان هیچ نەبێ لە ئەسیرکران.

6-کە کاک شەهابو هەڤاڵەکانیش لە ئێران گیران زۆر بەداخەوە من درەنگم زانی ئەگینا رەنگبوو بمان توانیبایا دەربازیان بکەین. بەڵام کە برانەوە بەغدا پێمانزانیو دوای هەڵوێستی قارەمانانەیان حەمەلەیەکی عالەمیان بۆیانکرد. ئەوەبوو دەیان هەزار ئیمزاو بروسکەیان بۆ کرایەوەو شەهید شەهاب کرا بە (زیندانی ساڵ) لە دنیاو هەوڵێکی زۆری بۆدرا بەڵام صدامی خوێنرێژی دڵڕەشی داخ لەدڵ بەهیچ جۆرێک گوێینەدایە هاوارو بانگەوازی ئازادیخوازانی دنیاو بێشەرمانە بە نازەنین خانی هاوسەری رایگەیان کە هەر دەیکوژێت. بەوجۆرە کاک شەهاب شەهیدکراو بو بە سەرقافڵەی شەهیدانی (ی.ن.ک)و شۆڕشە نوێیەکەمان، بەڵام نەخوێنەگەشەکەی خۆیو شەهیدی نەمر جەعفەری جوانەمەرگو شەهید ئەنوەر بەفیڕۆ رۆیشتو نەخەباتو رەنجیان: واداری ئازادیو رزگاریو مافی چارەی خۆنوسین لە کوردستاندا بەو خوێنانەو خوێنی دەیان هەزار شەهیدی نەمری تر هاتۆتە بەر. دەبا سەربنێتەوە شەهاب لە بەهەشتی نەمریدا بە ئاسودەیی سەربنێتەوە

ڕێبازەکەی، یەکێتیەکەی، پارێزراونو کاروانەکەشی هەر بەرێـگەوەیە واهاکا لە لوتکەی ڕێگە سەرکەوتو بە ئاوات گەیشت.

ژمارە (**248**)، ڕۆژ (**1992/11/22**)

## سەرووەریو نەمری
## بۆ شەهید ئەحمەد عەبدوڵلای بیرڕووناك

18-2ی هەموو ساڵێک یادی پێکهێنانی یەکێتی قوتابیانی کوردستانە. لەو ڕۆژەدا لە شاری بەغدا ساڵی (1953) لە ماڵی کوڕێکی شەخسیەتی گەورەو ناوداری کوردەواری کاکە زیاد ئاغای حەمەئاغای نەمر. یەکەم کۆبوونەوەی دامەزراندنی (ی.ق.ک) گیرا. لەو کۆبوونەوەیەدا ڕۆڵەی هۆشیارو هەڵکەوتووی گەلەکەمان، ئەحمەد عەبدوڵڵا کە ئەوسا لە دواساڵەکانی خوێندنی بوو لە کۆلیجی (دار المعلمین العالیه) دەورێکی دیارو ژیرانەی هەبوو. هەم لە رووی دەربڕینی بیروڕاو پێشنیازە وردو راستوڕەواکانی، هەم لە رووی چۆنیەتی ڕێکخستنو گەشەپێدانو پەرەپێدانی ریزەکانی خوێندکارانی کوردستاندا.

ئەحمەد عەبدوڵلا لاوێکی ژیری بادینی بوو. لەشاری کوردپەروەرو دێرینی ئامێدی لەدایک ببوبوو. خۆشی وەک شارەکەی دڵودەرونی بەبیروباوەڕی کوردایەتی پێشکەوتنخواز جۆشدرابوو. وەک خوێندکار، زۆر زیرەکو سەرکەوتووبوو لە خوێندنەکەیداو هەمیشە لە ریزی پێشەوەی خوێندکارەکانی هەڤاڵی خۆی بوو.

وەک ئینسان، لاوێکی رووخۆشی، قسەشیرنی، نوکتەبازی رووگەشی، دڵودەرون روونو دەستو دەموداوێن پاک بوو. زمانی عەرەبیو ئینگلیزیو هەردوو لەهجە کوردییەکەی باش دەزانیٚ. لاوێکی ئازاو نەترسو بەهەڵمەتو بێباک بوو لە دوژمنو لە مردن. لەو کۆبونەوەیەدا بەسەرۆکی (ی.ق.ک) هەڵبژێردرا، چونکە لە کادرە هەرەباشەکان بوو. لەماوەی سەرکردایەتیەکەشیدا زۆر چالاکانە کارەکانی خۆی ئەنجاندەداو زۆر زووش توانی لە موسڵو لەناو خوێندکارانی بادینانـدا چەندین ئەندام بۆ (ی.ق.ک) پەیدابکاتو رێکیان بخات.

رۆڵەی هێژا ئەحمەد عەبدوڵڵا لە کۆڕی سیاسەتیشدا خەباتگێڕێکی چالاکو نەبەزو کۆڵنەدەربوو. رێکخستنی پارتی لە بادینان هەڵوەشابۆوەو زۆر لە تێکۆشەرە دێرینەکان کۆڵیاندابوو وازیان هێنابوو. بۆیە ئەحمەدی هێژا توانی لەچەندین شاری بادیناندا ئەندامو شانەی پارتی دروستبکاتو لاوی بەوەج بهێنێتە ریزی رێکخستنەوە. هەربۆیەشکرا بەلێبرسراوی پارتی لە بادینانو لە رۆژەکانی رەشو گرتنو هێرشو شالاَوی رەشی دوژمندا خۆیراگرتو رێکخستنەکانی گەشەپێدا لە کاتێکدا هەندێ کەس بەرائەتیان دەداو هەندێکیتریش وازیان لە خەبات هێنابوو. هەربۆیەش لە کۆنگرەی چوارەمی پارتیدا بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا.

لە کۆڕی خوێندنیشدا سەبارەت بەتواناو ژیریو لێوەشاوەیی خۆیکرا بە مودیری متەوەسیتەی دهۆکو لەو بوارەشدا هەوڵێکی زۆریدا بۆ پەرەپێدانی خوێندنو پێشخستنی خوێندکارانی بادینیو گەشەپێدانی متەوەسیتەکە بەرەو (پانوی) دهۆک.

له هەڵگریساندنی شۆڕشی ئەیلولیشدا ئەحمەدی نەمر قارەمانێکی راپەڕینو رێکخەرێکی هێزی پێشمەرگەو پارێزەری رێکخستنەکانی پارتی بوو لە شارو لەلادێدا. لە رۆژە رەشەکاندا شانبەشانی شەهیدانی نەمر عەلی عەسکەریو عەلی حەمدیدا شەهید ئەحمەدیش بەگەشبینییەوە خۆڕاگرتو رێکخستنەکانی پاراستو سازیدان بۆ پێشمەرگایەتیو خەباتی نەهێنی. ئەوەندەی من دەمناسی ئەتوانم بڵێم یەکێک بوو لە رۆڵە هەڵکەوتووەکانی ژیرو ئازاو قارەمانو هۆشیاری بادینان.

هەربۆیەش شەهیدکرانی، بێئەوەی پێشمەرگەبێت، یان چەکداربێتن یان بەشداربێت لە ناکۆکی چەکدارانەدا زیانێکی گەورەبوو. بۆ مێژووش پێویستە بڵێم کە هەمیشە لایەنگری چارەسەرکردنی سیاسییانەی ناکۆکییەکان بوو.

بەڵێ شەهیداکرانی ئەحمەد عەبدوڵڵای نەمر زیانێکی گەورەبوو، بۆ هۆشیاریو پارتایەتیو خەوباتی سیاسیو کوردەواریو کوردایەتی.

لەم بۆنەیەدا دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ ئەو دەنگەڕەوایەی داوای دروستکردنی پەیکەرو ناونانی خوێندنگاو کۆڵانێک بەناوی ئەو شەهیدە ژیرو هۆشیارو نەمرەدەکات.

سەروەری بۆ شەهید ئەحمەد عەبدوڵڵای نەمر

هەزار سڵاو لە گیانی پاکی ئەو شەهیدەو هەموو شەهیدانی هۆشیارو هێژای کوردایەتیو رزگاریو دیموکراسی لە کوردستانو عیراقدا.

ژمارە (**2077**)، رۆژ (**2000/2/19**)

## د.سەید عەزیزم چۆن ناسی؟

دیـاره نـاوی سـەید عەزیـز کـوڕی سـەید عەبـدوڵڵای فەنـدی نەهری (گەیلانی زادە) نـاوێکی ناسـراو بـوو لەنـاو خەبـاتگێڕانی کوردایەتیدا. ئێمەمانان هەر لە سەردەمی لاوێتیماندا ناوی سەید عەزیزمـان بیـستبوو وەک ئەفـسەرێک کە بەشـداری راپەڕینـی بارزان و موکریـانی کـردووە و دەوری هەبـووە لە حزبـی هیـوادا. وێنەکەشـی لە رۆژی هەڵکردنـی ئـاڵای کوردسـتاندا لە مەهابـاد لەناوماندا بڵاوکرابۆوە.

بەڵام کاکە سەید عەزیز ئەو سەردەمەی ئێمەمانان چووینە کۆڕی خەباتی سیاسیی رێکوپێکەوە، نێردرابوو بۆ یەکێتیـی سۆڤیەت بـۆ خوێندن. پاشان تێگەیشتین کە لە راستیدا ئەوە دوورخستنەوە بـوو لەلایەن کۆماری کوردستانەوە بەناوی خوێندن و دەورەی ئەفـسەری دیـــتن (دەورەی ئەفـــسەری تانـــک). ســـەبارەت بەوەی کە لەو ســەردەمەدا ســەید عەبـدوڵڵا فەنـدی گەیلانــی زادەی بـاوکی نـاوی هاتبوو بۆ سەرکۆماری کوردستان لەجیاتی شـەهید قـازی مـحەمەد. ئەوەش باسێکە لێرەدا جێی نابێتەوە.

ئەوەبــوو پــاش رووخــانی کۆمــاری کوردســتان، خوالێخۆشــبوو ژەنەراڵ مستەفای بارزانی و چەند ئەفسەرێکی تریش دلێرانە خۆیان گەیاندە ئازربایجانی سۆڤێتی و سەریان دانەنواند نە بۆ شای ئێـران و نە بۆ حکومەتی عیراق.

هەندێک لە ئەفسەرەکانی تریش گەڕانەوە عیراق. کۆڵۆنێل بەکر عەبدولکەریم حوێزی خۆی نەدا بەدەستەوە و ملی دایە دەشت و دەر و شاخەکانی دەوروبەری کۆیە. خوالێخۆشبوو نوری ئەحمەد تەهاش کە روتبەکەی مێجەر بوو لە کۆماری کوردستاندا، کەوتە داوەوە و تەسلیم بە حکومەتی عیراق کرایەوە.

بەڵام شەهیدانی نەمر کۆڵۆنێل روکن عیززەت عەبدولعەزیزی ئامێدی و کۆڵۆنێل مستەفا خۆشناو و مێجەر خەیروڵڵا عەبدولکەریم و مێجەر محەمەد قودسی خۆیان تەسلیم کردەوە سەبارەت بە ناهومێدبوونیان بەو ناکۆکییەی کە لەگەڵ خوالێخۆشبوو ژەنەراڵ مستەفای بارزانیدا هەیانبوو.

دیارە بە لای منەوە ئەو شەهیدە نەمرانە کە دلێرانە و قارەمانانە لە مەحکەمەش وەستان، نەدەبوایە خۆیان بدەن بەدەستەوە. هیچ نەبوایە وەک کۆڵۆنێل بەکر حوێزی لە شاخەکاندا خۆیان حەشار دابا و، ئەگەر ملی سۆڤێتیشیان نەدەگرت ملی کێوەکانی کوردستانیان بگرتبا. واتە من پاکانە بۆ تەسلیمبوونەکەیان لەگەڵ هەموو قارەمانی و فیداکاریی جوامێرانەیاندا بە راست و رەوا نازانم.

جا بچینەوە سەر پرسیارەکە و وەرامەکەی بدەمەوە.

لە ساڵی 1955دا لە گەڕانەوەم لە چینەوە رێگەم کەوتە مۆسکۆ، لەوێ هەوڵم دا چەند رۆژێک بمێنمەوە و سۆراغی خوالێخۆشبووان ژەنەراڵ بارزانی سەرۆکمان و هەڤاڵان کۆڵۆنێل میرحاج و کۆڵۆنێل سەید عەزیز بکەم. چەندی هەوڵم دا هیچم دەستنەکەوت. تا رۆژێکیان لە شەقامێکی مۆسکۆدا پیاسەم دەکرد، مات و بێ تاقەت بووم، داماویش بووم

بەدەســـت ئەو شـــێوەی کـــارکردنەی ســـۆڤێتییەکان کە نەیاندەهێــشت نە دەســتمان، نە دەنگمــان بگــاتە ســەرۆکی خۆمــان و هەڤــاڵانی ســەرکردایەتی خۆمــان. لەجیــاتی ئەوەی بیـــانکەنە هـــۆی ڕێنـــوێنیکردن و هۆشـــیارکردنەوەمان لە خەباتەکەمانـدا تەنـانەت وەک ئەوەی خۆشـیان پێیـان بـاش و پەسەند بێت.

لە گەڕانەوەمـدا بە هەمـان شـەقامدا، دوو کەس لە پـێش مـنەوە دەڕۆیــشتن و بە عەرەبــی پــێکەوە قــسەیان دەکــرد. دەنگێکیــان بەلامەوە ئاشـنا بـوو، چـونکە لە رادیـۆی مۆسـکۆ قـسەی دەکـرد و ئەوساش رادیۆی مۆسکۆ ئەوە بوو کە هەموو شەوێ دەبوایە بەدیـار رادیۆوە بۆی دانیشم تا دەبڕایەوەش!

وابـــوو کە ئەو پیـــاوە (مهـــدی هاشـــم النجفـــی) خەبـــاتگێڕی کۆمۆنیستی ناوداری کرێکـاری عەبـادان و پێـشتریش هـی یەکەمـین دەستەی پارتی کۆمۆنیستی عیراق بوو لە سییەکاندا.

منیش بە وردی بە دویان کەوتم و هەر لێیـان نزیـک دەبـوومەوە، تا ئاوڕێکیان لـێم دایەوە و منـیش بە عەرەبـی رۆژباشـم لـێ کـردن. ئەوانـیش بەناچـاری سـڵاویان دایەوە و رووم کـردە خوالێخۆشـبوو (مهدی) کە بەدەنگ تەشخیصم کردبوو و گوتم: مامۆسـتا مهـدی بە راستی بۆ من رێککەوتنێکی خۆشە کە تووشـی جەنابـت هـاتم، هەم شـــەرەفی ناســـینتم پـــێ ببڕێـــت و هەم کارێکیـــشم پێـــت هەیە. لە ســـەرەتادا ویـــستی ئینکـــاری ئەوە بکـــات کە ئەو (مهـــدی هاشـــم النجفی)یە، بەڵام لە ژێر ئیلحـاح و ئیـسراری مـن بەوە رازی بـوو کە گـوێم لـێ بگرێـت. منـیش خـۆم پـێ ناسـاند و وتـم مـن ئەنـدامی (م.س)ی پـــارتیم و عەوداڵـــی ســـۆراغی ســـەرۆکەکەی خۆمـــانم و

دەنگوباسم پێیە بۆی هەم سیاسی و هەم هی منداڵ و خانەوادە و بارزانییەکان بەگشتی.

دیاربوو قسەکانم بەلایەوە دەیهێنا لەسەری بڕۆین، بۆیە پێشنیاری کرد بچینە چایخانەیەک، بەڵام من دەعوەتم کرد بۆ هوتێلەکەم (هوتێل موتروپول) کە لێیەوە نزیکبووین. لەوێ زۆری لێ پاڕامەوە کە یارمەتییەکم بدات و دەنگم (گەر ناکرێ دەستم) بگەیەنێت هەم بە کۆمیتەی مەرکەزی حزبی شیوعیی سۆڤیاتی و هەم بە سەرۆک بارزانی یان هیچ نەبێ خوالێخۆشبوو میرحاج یان سەید عەزیز. وا دیاربوو ئەویش دڵی نەرم بوو. پاش پرسیارێکی زۆر بەڵێنی دا بێتەوە لام و سەرم لێ بداتەوە دوای ئەوەی پرس بە شوێنی خۆی دەکات.

بۆ شەو کە تەلەفۆنی لەگەڵ کردمەوە و بەڵێنی دا بەیانی دوای نیوەڕۆ بێتە لام لە ئۆدەکەی خۆم، بەمە نەختێ فەرامۆشیم هات. لەکاتی دیاری کراودا هات و پێی گوتم کە:

1- هەموو ئەوانەی لێیان دەپرسم ساغ و سەلامەتن.

2- ژەنەراڵ بارزانی لە مۆسکۆیە، بەڵام ناتوانم بیبینم، بەڵام قسە و راسپاردەکانی پێ رادەگەیەنم.

3- میرحاج لە ئاسیای ناوەڕاستە و سەید عەزیز لە لینینگرادە و خەریکی خوێندنە.

4- خوالێخۆشبوو حەمەدەمین میرخانیش لە مەدرەسەی حزبییە و دەخوێنێت.

هەلم قۆزتەوەو ئەو نامەیەم بۆ خوالێخۆشبوو بارزانی نارد کەکاک مەسعود بارزانی بەڕێز لەکتێبەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە.

هەروەها دەنگوباسی ولادەتـی شـەهید سـابری کـوڕی کە لەدوای سەفەری باوکی لەدایک بوو شـێخ ئەحـمەدی نەمـر نـاوی (صـابر) ی لێ نابوو، و هی کاک مەسعود کە منداڵ بوو لەماڵی باپیری مەحمود ئاغای زێباری دەژیاو دەربەدەری بارزانییەکان و شەهیدکرانی کـوڕی ئولـوبەگی نەمـر بەدەسـتی زێبارییەکـان و چەنـدین خەبەری تریـشم بۆنـارد. پاشـان خـوا یـاربێ لەوتـارێکی تـایبەتی دا باسـی ئەوەش دەکەم.

بەڵام ئەوەی لێـــرەدا مەبەســـتە زانـــیم کە ســـەید عەزیـــز لە لینینگـرادەو خەریکـی دکتـۆرایە لەسـەر خەبـاتی رزگـاری خەڵکـی کوردســـتان. ئەم زانیـــارییە یـــارمەتی دام کە لە ســـاڵی 1957 دا سۆراغی سەید عەزیز بکەم و یەکێک لە داواکانم بێـت کە پێـشکەش بە سۆڤیەتیەکانمان کردبوو. ساڵی 1957/یش چـوومە مۆسـکۆ بـۆ بەشـداری کـردن لەفیـستیڤاڵی لاوان و خوێنـدکارانی دنیـا. بەڵام ئەوەی راست بێت زۆرتر نیازم دیداری بارزانی و سـەید عەزیـز بـوو. دیتـــنەکەی ســـەید عەزیـــز زۆر زوو هـــاتەدی. تـــازە گەیـــشتبووینە مۆسکۆ، بەیانیەکیان لەهۆڵی بەشی وەفدی عیراقـی، ئـێمەی لاوانـی کورد بە جلی کوردییەوە وەستابووین، کە دوو ئەفەندی لێمان نزیک بـوونەوە و یەکێکیـان بەکرمـانجییەکی زۆر رەوان رۆژبـاش و چـاک وچۆنی لـێ کـردین، ئـێمەش شاگەشـکەبووین پـێ یـان کە خۆیـان بەکـوردی سـۆڤیەت دایە ناسـاندن، بەڵام شـێخ عەلـی بـامەڕنی کە یەکێک بوو لەئەندامانی وەفدەکەو برا شیوعییەکان هێنابوویان منـی جیـاکردەوەو گـوتی: مـام جەلال مـوو زەردەکەیـان سـەید عەزیـز شـەمزینی یەو تەئکیـدی کـرد کە ئەو وەختـی خۆشـی دەیناسـی، منیش سوپاسم کردو لەدوو (کـوردە سـۆڤیەتیەکە) نزیـک بـوومەوە،

لێم پرسینەوە خەڵکی کوێن؟، دووەمەکەیان کە پاشان دەرکەوت خوالێخۆشبوو د. مرادی رەزماوەر بوو، گوتی (من هەم کوردی شورەویم)! دیارە بەمە یەکسەر خۆی ئاشکرا کرد کە کوردی سۆڤیەت نییە. چونکە (من هەم) و (شورەوی) لەجیاتی سۆڤیەتی دەری خست کە دەبێ کوردی ئێران بێت! ئەوسا من تەشجیع بووم ئەوەکەی تریانم جیاکردەوەو گوتم (کاکە سەید عەزیز بۆچی خۆتمان لێ دەشاریتەوەو من فڵانە کەسم و بەدوای تۆشدا عەودالم) لەپێشەوە حاشای کرد، بەناچاری شێخ عەلیم بانگ کردو ئەویش یەکسەر گوتی (سەید عەزیز چەوانی)و ماچی کرد وباسێکی رابردووی بۆ کرد کە چۆن یەکتربیان دەدیت و خوالێخۆشبوو سەید عەزیزیش چاری نەما سەلماندی بەڵام تکای کرد کە نەیکەینە هەڵلا و کەسی تر نەزانێت و بەڵێنی پێ داین سەرمان لێ بداتەوەو منیشی جیاکردەوەو گوتی (مەلا مستەفا لەمۆسکۆیەو هەر ئێستەش وا دەچم بۆ لای و خەبەری هاتنی تۆی دەدەمێ). ئومێدیشی داپێم کەرەنگە ئەمجارەیان ماوە بدەن بەدیداری ژەنەراڵ بارزانی شاد ببین. خۆشی ئیتر هەموو رۆژێک دەهاتەوە بۆ لامان، یان بەتەنیا یان لەگەڵ د.مرادی رەحمەتی دا. ئەوسا سەید عەزیز بەدوورو درێژی سەرگوزەشتەی خۆیانی بۆ گێڕامەوەو بیروراو بۆچوونەکانی خۆشی لەسەر هەموو مەسەلەکانی کەبەلامانەوە گرنگن، وەک پێویستی بوونی پارتی پێشڕەوی کوردایەتی، زۆر بەراشکاوی پێ راگەیاندم و داوای لێ کردم کە بەهەڤاڵان بڵێم سوور بین لەسەر رێی خەباتی گەلی خۆمان و دەبێ خۆمان جۆشی بدەین و رێکی بخەین و پارتی پێشڕەو خۆشی رێبەری بکات و ئەوەشی گوت کە تێزەکەشی هەر لەسەر جووڵانەوەی رزگاری خەڵکی کوردستانە.

پێشی گوتم کە چیتر نابێ کوێرانە هەرچی سۆڤیەت گوتی وەک تووتی بیلێینەوە، بەتایبەتی رووداوەکانی کۆنگرەی بیست ئەو دەرسەی بۆ داداوین. هەروەک بە بۆنەی هەڵەکانی ستالینیشەوە زۆر دژی عیبادەتی شەخسی وزلکردنی سەرکردە وتیوری زەعیم و سەرۆکی رێبەر قسەی کردو بەتێرو تەسەلی باسی دەوری جەماوەر لەمێژووداو ئەهمیەتی سەرکردایەتی بەکۆمەڵ و رێبەری گشتیی، نەک هی تاکە فەردی، بۆ کردم. بەم جۆرە ئەو سەرکردە هۆشیارەم بۆیەکەم جار دیت و بەناسینی شادبووم.

ژمارە (**1825**)، رۆژ (**1999/3/18**)

# کاکە ئەحمەدی دزەیی
# خەباتگێڕە دلێرو شۆڕەسوارە جوامێرەکەی کوردایەتی

**پێشکەشە بەگیانی پاکی ئەو کاکە ئەحمەدەی**
**کە تا مردن کەڵ ژیا، بەڵام زۆر بەداخەوە کەم ژیا**

***بەشی یەکەم**

لەنـــاو هــۆزی دزەییـــدا چەنـــدین کەڵەپیـــاوی جـــوامێرو رۆڵەی خوێنـــدەوار هەڵکەوتـــوون. هەر لەدێرزەمانیـــشەوە ئەو هـــۆزە کـــورد پەروەرە نەک هەر پـــارێزەری نـــاوچەی گرنگـــی قەراجو کەنـــدیناوەو قەرەچووغ و دەورووبەری بـــووە، کە بەداخەوە لەدوای 31ی ئـابەوە ئەویش بەر تەعریب کەوت، بەڵکو چەنـدین کەڵەپیـاوی عەشـایەریو چەنـــدین شـــاعیرو خەبـــاتگێڕی شۆڕشـــگێڕو خوێنـــدەواری ژیـــرو هونەرمەنـــدی بەتوانایـــان لەنـــاودا هەڵکەوتـــووە.لەســـەروبەندی دامەزراندنی حکومەتی عێراقدا هۆزی دزەیی پـشتیوانیان لەخەبـات و داخوازییەکـانی خەڵکـی سـلێمانی دەکـردو بەدەمـی خۆیـان دەنگـی دلێـــری هـــۆزی دزەییـــان لەلایەن خوالێخۆشـــبوو خـــدری پاشـــاو خوالێخۆشبوو عەلی مەحمودی کاکەخـان و چەنـدین سـەرۆکی تـری هـۆزی دزەیـی بەرزکـرایەوە. تەنـانەت لەشۆڕشـی شـێخی نەمریـشدا

شۆڕەسوارانی دزەیی بەڕێبەری خوالێخۆشبوو عەلی مەحمودی کاکەخان بەشداریان کردووە.

لەچلەکانیشدا پۆلێک لەخوێندەواری هۆزی دزەیی هاتنە کایەی خەباتی سیاسی و چەپو کوردایەتی یەوە. هەندێک لەموڵکدارەکان- نەک براو کوڕەکانیشیان- خۆشیان هاتنە کایەی خەباتی راستەقینەوە.

شاگوڵی ئەو چەپکە گوڵەی پێکهاتوو لەرۆڵە خوێندەوارو ژیرەکانی هۆزی دزەیی و سەرقافڵەی نەبەزو ڕێچکە شکێنەکەی رێگەی سەختی خەباتەکەش، کاکە ئەحمەد حەمەدەمینی نەمربوو، کە بەدڵسۆزی و ژیری و فیداکاری و لەخۆبوردوویی و رەوشت و خووی بەرزو جوامێرانەی خۆی بەو پلەیە گەیشتبوو.

کاکە ئەحمەد هەرچەندە زۆر دەستی لەخوێندن هەڵگرتبوو، بەڵام رۆڵەیەکی عاقڵ و ژیرو بەهۆش و هۆشیاربوو: هەمیشەهەوڵی خوێندنەوەو خۆفێرکردن و هۆشیاربوونەوەی دەدا.

هۆی دەست لەخوێندن هەڵگرتنەکەشی، هەر هەڵوێستی جوامێرانەو هەست بەمەسئولیەتی خانەوادەیی کردنی خۆی بوو. سەبارەت بەوەی کە حەمەدەمیناغای باوکی خوالێخۆشبوویان زوو عەمری خوای کردبوو، کاکە ئەحمەدی کوڕە گەورەشی بۆ سەرپەرشتی کردنی ماڵ و دیوەخان و پەروەردەکردنی براکانی (ئەنوەر، موحسین، سەعدی، هۆمەر) ئەو فیداکاریەشی کردبوو. بەڵام بەهیچ جۆرێک لەکۆڕی خوێندەواران و هۆشیارانی هەولێر دانەبڕابوو. بەپێچەوانەوە، سەبارەت بەنێوانی توندوتۆڵی لەگەڵ تێکۆشەرەکانی هەولێر وەک خوالێخۆشبوو مامۆستا عەونی یوسف و بەخزمایەتیشی لەگەڵ بیر رووناکانی هەولێر وەک خوالێخۆشبووان

عیزەدینەفەنـدی مەلا فەنـدی و کـاکە زەیـد، هەمیـشە لەکـۆڕی سیاسەت و موناقەشەو باسوخواسی وڵاتدا بەشداربوو.

کاکە ئەحمەد هەر لەلاوێتییـەوە چووبـووە ریـزی کـوردایەتییەوەو یەکێک بـوو لەئەنـدامە چالاکەکـانی لقـی عەشـایەری حزبـی رزگـاری کـورد کە بەڕێـز خوالێخۆشـبوو عیزەدینەفەنـدی مەلافەنـدی و شەخـسیەتی کـوردپەروەری نـاودار کـاکە زیادئاغـای کـۆیەو خوالێخۆشـبوو عەلـی مەحمـودی کاکەخـانی کـۆنە پێـشمەرگەی شۆڕشی شێخی نەمرو چەنـدین پیـاوی دڵـسۆزی عەشـایەری تێیـدا بەشداربوون.

کاکەئەحمەدی نەمر نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزو چالاکو نەتـرسو نەبەزو بەگوڕبوو. هەر بـۆیەش لەکـاتی راپەڕینـی بارزانـدا (1943-1945) دلێـرانە سـەرگەرمی چـالاکی سیاسـیو راگەیانـدنو پیتـاک کۆکردنەوەبوو بۆ تێکۆشەرانی بارزان. هەر ئەو هەوڵو چالاکییەشـی بووە هـۆی درانـی بەمەحـکەمەی عـورفی و سـزادارانی. لەوساشـەوە کاکەئەحمەدی دزەیی نێوانی زۆر خۆش بوو لەگەڵ شـێخ ئەحـمەدی بارزانی نەمـرو لەزینـدان و دەربەدەریـشیاندا سـەردانی هەر دەکـرد، بۆیە پایەیەکی تایبەتی هەبوو لەلای شێخ ئەحمەدی نەمر.

دوای هەڵوەشاندنەوەی رزگاری-یـش کـاکە ئەحـمەد چـووە ریـزی پارتی دیموکراتی کوردی عیراقەوە کە پاشان ناوی گۆڕدرا بەپـارتی دیموکراتی کوردستان-عراق.

هەرچەنــدە کــاک ئەحــمەد موڵکــدارو دەوڵەمەنــدبوو، بەڵام بیروباوەڕی زۆر پێشکەوتنخوازانەبوو، دژی دەرەبەگـایەتی و زوڵـم و زۆرو چەوسـاندنەوەبوو، پـشتیوانی بیروبـاوەڕی سۆشیالیـستیو دادپەروەری کـۆمەڵایەتی بـوو، لەنـاو پارتیـشدا لەگەڵ ئەو بـاڵەی

پارتی تەبابوو کە دەیانویست کەڵک لە (م.ل)و سۆشیالزمی عیلمی وەرگرن. واتە هەمیشە لەگەڵ باڵە حزبییەکەو باڵە چەپەکەو باڵە پێشکەوتنخوازەکەی پارتی بوو.

جارێکیان لەسەرەتای پەنجاکاندا رۆژنامەنووسێکی ئەمریکی لەگەڵ کاکە ز ەیدی رەحمەتی دەچێتە لای کاکە ئەحمەد لەدوگردکان. پاشان کابرای رۆژنامەنووسی ئەمریکا لەوتارێکیدا کە بەناونیشانی (S.O.S) لەکوردستانەوە لەگۆڤاری (لایف)دا بڵاوی کردەوە، بەسەرسوڕمانێکی زۆرەوە نووسیبووی کەموڵکداری دەوڵەمەندی کورد (کاکەئەحمەد) لەدیوەخانە خۆشەکەی خۆیدا پشتیوانی لەسۆشیالزم دەکردو دژی دەرەبەگایەتی و ئیمپریالیزم بوو. لەسیاسەتی دەرەوەشدا یەکێتی سۆڤیاتی خۆشدەویست و سیاسەتی وڵاتانی رۆژئاوای پێ ناڕاست و نارەواو دژ بەکورد بوو. لەقسەو باسی تایبەتیشدا ئەو رۆژنامەنووسە سەری سوڕمابوو لەو سادەیی و نێوانە باشەی کاک ئەحمەد لەگەڵ جوتیارو خزمەتکارەکانی. کە هەر بەڕاستی ئەوە بەشێکی دیاری رەوشت و خوی بەرزی کاکەئەحمەد بوو.

**رەوشت و خوی کۆمەڵایەتی و سیاسی کاکە ئەحمەد**

کاکە ئەحمەدی نەمر نموونەی مرۆڤی دڵسۆزو بەئەمەکو دەستو دەمو داوێن پاک بوو، رەوشتو خوی کۆمەڵایەتی زۆر بەرزبوو، لایەنە چاکەکانی هۆزەکانی کوردەواری تێکەڵاو کردبوو بەلایەنە باشەکانی شارستانیەتی کوردستان. پیاوێکی سەرڕاستو راستگۆبوو. رۆڵەیەکی نەترسو نەبەزی کوردایەتی بوو. بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازو شۆڕشگێڕانەبوو. پیاوێکی مەبدەئیو بێ پەناوپێچو راشکاوبوو. پیاوێکی دڵ گەورەو بەخشندەو سەخی تەبیعەت بوو،

ڕووخۆش، دەم بەپێکەنین، گەشبین بوو. بـاوەڕی تەواوی بەڕەوایـی کێشەی کوردو پێویستی خەبات و فیداکاری لەپێناویدا هەبوو.
هەرچەندە لەبنەماڵەی ئاغـا ناودارەکـانی دزەیـی بـوو، بەڵام سـادەو ساکارو بێ دەعیەو بێ فیزو ناحەز بەفیـشاڵ و خۆهەڵکێـشان بـوو. لەگەڵ جوتیارەکانی گوندەکانی خۆیان دۆست و هەڤاڵ و قسەخۆش و تەباو گونجاو بوو.

لەڕووی هۆشـیاری سیاسیـشەوە پیـاوێکی تێگەیـشتوو بەهـۆش و ژیربـوو. دەیخوێنـدەوەو دەیپرسـی و گەشـەی دەکـردو دەنگوباسـی رادیۆکـــان و دنیـــای مـــوراقەبە دەکـــرد. هـــاتووچۆی مەجلیـــسی سیاسییەکان و سەرکردەکانیشی دەکرد. پیـاوێکی خـۆڕاگرو نەگـۆڕو بەورەو چـــاونەترس بـــوو. لەبیرەوەرییەکـــانم لەگەڵیـــدا هەنـــدێ نموونەتان بۆ دەهێنمەوە.

*بەشی دووەم

## هەندێ لەبیرەوەرییەکانم

ئەوەی ڕاست بێ لەو ڕۆژەوە کە لەنزیکەوە کاک ئەحمەدم ناسی، هەتـا ئەوسـاڵەی لێـک دابـڕاین بەسـەفەری مـن بـۆ دەرەوەی وڵات، چەندین بیرەوەریم هەنە لەگەڵ ئەو جوامێرە.

پـــێش بینینـــی کـــاکە ئەحـــمەد ناوبـــانگیم بیـــستبوو. دەمزانـــی کەلاوێکـــی ئاغـــای دزەیـــی تێکۆشـــەر هەیەو ئەنـــدامی حـــزبەو شەخسیەتێکی خۆشەویستە.

ساڵی 1948 بۆ یەکەمین جار ناویم بیست. ئەویش لەجەژنی نەورۆزدا بوو. کە وەفدێکی لاوە شـیوعییەکانی دزەیـی هـاتبوون

بـۆ بەشـداری لەو نەورۆزەی حـشع لەکـۆیە جەژنەکەی دەگێـڕا. لاوێکی ئێسک سووک و ژیـکەڵەو قـشت و مێردمنـداڵێکی دەنـگ خـــۆش وەک بولبـــول لەجەژنەکەدا دەیخوێنـــد کە ئەویـــش هونەرمەنـدی ژیـرو خەبـاتگێڕی هوشـیار کـاکە هـۆمەری دزەیـی بوو. ئەویَ دەمیَ ململانێی شیوعی و پـارتی هەبـوو. هەرچەنـدە کاکە هۆمەر خۆی شیوعی نەبوو، بەڵام دوو برای شـیوعی بـوون (بەڕێـزان د.ئەنـوەر+ کـاک محـسن) دوو براشـی پـارتی بـوون (کاکە ئەحمەدی نەمر+ کاکە سەعدی موهەندیس) لەوەوە ناوی کـاکە ئەحـمەدم بیـست. لای ئـێمە لەکـۆیە بەکـاکە زیـاد ئاغـای دووەم درایە قەڵەم. بـۆیە زۆرم حەزدەکـرد لەنـزیکەوە ببیـنم و بیناســـم. ئەوەبـــوو هـــاوینی 1950 کە ناوەنـــدی کـــۆیەم تەواوکردبوو، چووم بۆ هەولێر هەم بـۆ بەشـداری لەکۆبـوونەوەی لقی پارتی و هەم بۆ زەمینە خۆشکردن بۆ قەیدبوونم لەسانەوی هەولێر.

لەو سـەفەرەدا کـاکە ئەحـمەدم لەمـاڵی خـوالیَ خۆشـبوو عەونـی یوسف ناسی. یەکەم ئینتیباعم زۆر باش بـوو. بەلاوێکـی خەملّیـوی قـۆزو رووبخـۆش و سـەنگین و سـادەو ژیـر هـاتە بەرچـاوم. قـسەی شـیرین و هەڤـاڵانە بـوو. هەرچەنـدە فەرقـی تەمەنمـان پێمـانەوە دیاربوو، هەرچەندە پایەی کۆمەڵایەتیمـان وەک یەک نەبـوو، کەچـی ئەوەندە میهرەبان و برایانە هـاتە بەرچـاوم، کە لەدڵـی خۆمـدا وەک برایەکی گەورەی خۆشەویست جێگەم بـۆ کـردەوە. ئەوە وردە وردە چەسپا تاپاشان لەگەڵ هۆمەری دزەیی دا زۆر جار باسم دەکـرد کە کاکە ئەحمەدم بەلاوە وەک کاکە جەنگـیم لەرووی کـۆمەڵایەتی وایە، بەڵام لەرووی حزبـــی یەوە لەپێـــشترو نزیکتـــرە! ئەویـــش بەزمـــانە

شـیرینەکەی هەمیـشەو (ئێـستەش) کە دەیـدیتم و دەمبینـێ دەڵـێ (کاکە جەنگیم چۆنە!).

لەو دیتنەدا زۆر دڵم پێ خۆش بوو. وەک کاکە زیادئاغای کۆیەم هــاتە بەرچــاو کە شەخـسیەتێکی کــۆمەڵایەتی گەورەی کــۆیەو کـوردەواری بـوو. کـاکە ئەحمەدیـشم بەشەخـسیەتێکی کـۆمەڵایەتی گەورەی کــوردەواری هــاتە بەردڵ و چــاو، کە نەک بــۆ ژیــان و گوزەران، نەک بۆ داخوازی چینـایەتی، بەڵـکو بـۆ بەرزی و رزگـاری گەل و نیـشتمان، بـۆ ژیـان و گـوزەرانی کـۆمەڵانی خەڵــک، بـۆ کوردایەتی هەوڵدەدا. هەروەک بەپیاوێکی بیر رووناکی مێشک و دڵ و دەروون فراوان و پاک هاتە بەرچاوم.

ئەوێ دەمێ لەناو ئاغاکـانی دزەیـی دا هەر چـوار شۆڕەسـوارەکە کوردایەتییان دەکرد ئەویش بەشێوەی حزبایەتی، بەڵێ هەندێ لاوی تــر هەبــوون، لەهەمــوو تایفەکــان کوردپەروەربــوون، بەڵام زۆربەی زۆریان خوێندەوارو خوێندکاربوون.

ئەوانەی بەئاغــاش حیــساب بــوون، هەنــدێ لاویــان دڵیــان بــۆ کوردایەتی لێ ی دەدا بەڵام نەهاتبوونە ناو گونگەلەکەوە.

هەر لەو ســـەفەرەداو دوای تەواوبـــوونی کۆبوونەوەکـــانی لقـــی هەولێری پارتی، کاک ئەحمەد کاک عەونی و منیشی دەعـوەت کـرد بــۆ دوگردکــان. ئــێمەی بەجێــبەکەی خــۆی بــرد. کەچــووینە دیوەخانەکەی هەندێ شتی تریشم بۆ دەرکەوت: جـگە لەسـادەیی و قــسەی خــۆش و شــیرینی لەگەڵ خەڵــکەکە، نێوانیــشی خــۆش و دۆســتانەبوو لەگەڵیــان، ســادەو برایـانەبوو لەڕەفتاریـدا لەگەڵیـان، (فەلاحەکانـ کرمانجەکان) بەناوی خۆی بانگیان دەکرد واتە (کاکە ئەحمەد) نەک وەک ئاغا، بێ تەکلیفـو پێچ و پەنـا لەگەڵـی دەدوان

ئەویــش هەروەهــا. لەوێ بــۆم دەرکەوت کە لەنــاو فەلاحەکــانی دا خۆشەویست و ڕێزدارە.

شەو کـاتی قـسەو بـاس بـۆم دەرکەوت کە بیروباوەڕیـشی چەپە. وەک هەموومــان شــەوانە رادیــۆی مۆســکۆو رادیــۆی دیمــوکراتی ئازەربایجانیــشی دەکــردەوە. ئەویــش بەو بیروبــاوەڕە ناســرابوو. تەنانەت دوای ماوەیەک کە کاکە زەیدی رەحمەتی رۆژنامەنووسێکی ئەمریکـی لەگەڵ خـۆی بردبـوو بـۆلای، ئەمریکـاییەکە وەک لەوتـارە بڵاوکراوەکەیدا نووسیبووی، بەلایەوە زۆر سەیر بووبوو کە ئاغـایەکی تێرو تەسەلی کورد دۆستی سۆڤیەت بێـتو لایەنگـری چـاک کردنـی کــــشتوکاڵ و دابەشــــکردنی زەوی بێــــت و سۆشــــیالزمی پــــێ لەسەرمایەداری باشتربێت.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە کاکە ئەحـمەد لەوسـاوە کە لەسـەر شۆڕشــی بــارزان لەســاڵی 1945 درابــووە مەحــکەمەی عــورفی، هەمیــــشە هەر لەژێــــر چــــاوەدێری پــــۆلیس دا بــــوو، وە بە (کوردپەروەرێکی شیوعی) مەشبوە کرابوو!

لەو ســاڵەی خوێندنیــشم دا لەهەولێــر (1950-1951) کــاکە ئەحمەدم باشترو چاکتر ناسی هـاتووچۆی زۆرمـان هەبـوو لەگەڵیـا. تەنانەت ناوبەناو سەری لەمـن و کـاکە قـالەی بـرادەری دێرینیـشمی دەدا کە پــێکەوە لەتەیـراوە خـانوویەکی بچکۆلەمـان گرتبـوو. ئەمە ســەرەڕای دەعــوەتە زۆرو زەوەنــدەکانی بۆمــان بــۆ دوگردکــانو کۆبوونەوەکان لەماڵی خوالێ خۆشبوو کاک عەونی لەگەڵیا.

هەرهەمان ساڵیش ئاگاداری چالاکی حزبایەتی خۆی و سێ شۆڕە سوارە ئاغاکەی تر بووم سـەبارەت بەوەی کە مـن ئەنـدامی لیـژنەی ناوچەی هەولێریش بـووم. لەهەمـان سـاڵدا هەمـوو هێنـان و بردنـی

بڵاوکراوەی نهێنــی پارتیمـان بەئوتـومبیلەکەی کـاک ئەحـمەدو کـاک برایم عەلی دزەیی ئەنجام دەدا... هەردووکیان ئازایانە لەکەرکوکەوە رزگــاری و بەیانەکانیــان دەهێنــاو نــامەو راپۆرتەکــانی ئێمەشــیان دەبردەوە.

لەچالاکی ناو جوتیارانیش دا کاک ئەحـمەد هاریکـارێکی باشـمان بوو، و هەمیشە بۆ هەموو کارێکی پارتی سازو ئامادەبوو.

ژمارەکانی (1867، 1868)، رۆژانی (25ـ 26/5/1999)

## لەیادی دۆستی دێرینمان
## خوالێخۆشبوو مەجیدخاندا

شەوی نەورۆزی 1962، شەوی چالاکییەکی بەربڵاوی شەڕی پێشمەرگانە بوو لەکوردستانی عیراقدا، پێم وایە ئەوە یەکەمین چالاکییەکی وا بەربڵاویش بوو، لەو شەوەدا بەپێی نەخشەیەکی دیاریکراو، دەبوایە:

1-شەهید عەریف مەجید شوانی مەخفەرەکەی خۆی بگرێت لەمالوومەو پاشان بەخۆیو پۆلیسە پێشمەرگەکانییەوە، خۆیان بگەیەننە مەخفەری گاپیلۆن بەناوی ئەوەی کە هەڵاتوون لە (یاخییەکان)و کەچوونە ژوورەوە، ئەو مەخفەرەش بگرن. بەڕاستی بەقارەمانانەوەو ژیریو نەشلەژانیشەوە هەروای کرد.

2-بەخۆیو پێشمەرگەکانییەوە (ئەو پۆلیسانەی دەبنە پێشمەرگە)و چەکوتفاقی زیادەوە خۆیان بگەیەننە لای شێخ مەحمودی کارێزەو بەڕێبەری ئەویش بچن لەئەزمەڕە بچکۆلە دامەزرێنو بەڕاستیش هەروایان کرد.

3-کوێخا کەریمی ماوەتیش بەهێزێکی پێشمەرگەوە دەوری مەخفەری گرگاشێ بگرنو بیگرن- هەرواشیان بەچاکیو ئازایانە کرد.

4-كاك عەولاّى ئەحمەدى رەسواغاش (كاك عەولاّى دەخون) لەگەڵ هێزێكى پێشمەرگەى هەولێرى كە برێكى باشيان عەريفو پۆليسە دلێرەكانى هەولێر بوون؛ دەورى مەخفەرى باسنێ بگرێتو بيگرن، ئەوانيش ئازايانەو دلێرانە ئەركەكانيان ئەنجامدا.

5-مامجەلال-يش بەهێزێكەوە دەورى مەخفەرى چوارتاو شارۆچكەى چوارتا بگرێتو بۆ پەك خستنيان لەجوولاّنو يارمەتيدانى مەخفەرە ئابلۆقە دراوو پەلامار دراوەكانى قەزاى چوارتاو هێزێكى باشيش دابنرێت لەچەمى تەگەران بۆ بەگژاچوونى ئەو هێزەى ميرى دەينێرێت بۆ كردنەوەى ئابلۆقەكەو رزگاركردنى چوارتا، واش پێشبينى كرابوو (هەرواش دەرچوو) كەشەڕى سەرەكى لەچەمى تەگەران دەبێت، بۆيە هێزێكى باشى خۆشناو- باڵەكايەتى بەسەرۆكايەتى شەهيدى نەمر حەميد كاوانى بۆ ئەو شوێنە داندرابوو. كە ميريش هێزێكى دوو سەد كەسى پۆليسى نارد كەوتنە كەمينەكەوەو چەندين بريندارو چەندين كوژراويان داو (13) ئوتومبێليان لێ گيرا، كەئاگرى شەوى نەورۆزيان پێكراوەو زۆريش تەقەمەنىو چەندين چەكيش دەسكەوت بوو. سەد مەخابن تيكۆشەرى نەمر حەميد كاوانى لە شەڕيان لەگەڵ فڕۆكەدا شەهيد بوو، ئەگينا پۆليسەكان ئابلۆقە درابوونو دەگيران.

ئەو سەركەوتنە گەورەيەى شەوى نەورۆزى 1962 دەنگێكى گەورەى دايەوەو كارێكى زۆرى كردە سەر ورەى پێشمەرگەو خەڵكەكەو زيادبوونى ژمارەى پێشمەرگەو ژمارەى چەكو تەقەمەنيش.

## نەخشەی رزگارکردنی پێنجوێن

دوای ئەوەو بەکەڵک وەرگرتن لەکەشوهەوای سەرکەوتووی پێشمەرگانەو مەعنەویاتی بەرزی خەڵک، ورەی پۆلایینی پێشمەرگە، رووومان کردە ناوچەی پێنجوێن بۆ رزگارکردنی. لەوێ دەبوایە هێزی عەشایرو پیاوماقوڵان راکێشین بەلای خۆماندا. کلیلی سەرکەوتنیش لەگیرفانی خوالێخۆشبوو حەمەڕەشید خاندا بوو کە لەجەمهوریەتی کوردستانی مەهابادیشدا روتبەی ژەنەراڵی پێبەخشرابوو، شان بەشانی شەهید سەیفی قازیو خوالێخۆشبوو ژەنەراڵ مەلا مستەفای بارزانیو عومەرخانی شکاک. بۆ رازی کردنی حەمەڕەشیدخان-یش پێویستیمان بەخوالێخۆشبوو مەجیدخانی کوڕی هەبوو.

من پێشتر خوالێخۆشبوو مەجیدخانم ناسیبوو. کە لێپرسراوی پارتی بووم لەسلێمانی لەساڵی 1960-1961دا، چەند جارێک خوالێخۆشبوو مەجیدخانم دیبوو. مەجید خان پیاوێکی ژیرو ماقوڵو قسەزانو رووخۆش بوو. هەستی کوردایەتی لەدڵو دەروونیا دەیجولاند. من توانیبووم زوو ببمە دۆست لەگەڵیاو نێوانمان زۆر خۆشبوو. بۆیە پەنام بردەبەر بۆ رازی کردنی خانو پیاوماقولانی تری ناوچەکەش. ئەویش لەوەلامی راسپاردەی مندا پلانێکی بۆ پێشنیار کردبووم لەگەشتەکەماندا بۆ ناوچەی پێنجوێن بۆ سەردانی پیاوماقولانو خان. ئەرکی رازیکردنی خانیشی خستبووە ئەستۆی خۆی.

بۆیە ئێمەش بەدڵنیاییەوە بەڕێکەوتین بەرەو ناوچەی پێنجوێن، شەهیدی نەمر مەلا رەسوڵو چەندین کادری پێشمەرگانەی ترم لەگەڵ بوون. ئەوسا بەپێ دەڕۆیشتین، نە ڕێگەی ئوتومبێل هەبوو،

نه ئوتومبێلمان هەبوو. وەزعی مالیشمان زۆر خراپ بوو، جلمان شڕ بوو، زۆریش پـێڵاو دڕاوو پـێڵاو خـراپ بـوون، مـن خـۆم پـێڵاوەکەم دڕاوبـوو، ژێـرەکەی داپچڕابـوو، بەپەت بەسـتبوومەوە، لەوەش ئەو کەڵـکەم وەرگـرت کە پێـشمەرگەی پـێهێـور بـکەمەوە. هەرکاتێـک پێشمەرگەیەکی پێڵاو شڕ دەهاتو پارەمان نەبوو پێڵاوی بۆ بکـڕین، بەوە دڵــم دەدایەوە کەدەمگــوت وەرە پێڵاوەکانمــان بگــۆڕینەوە!! ئەویــش کە پــێڵاوە شــڕەکەی دەدیــت؛ رازی دەبــوو. بەڵام هەروا بــێجــلو پـــێڵاو نەمـــاینەوە! کەنزیـــک بـــووینەوە لەدێیەکەی خوالێخۆشـــبوو حەمەڕەشـــید خـــان؛ خوالێخۆشـــبوو مەجیـــدخان بەپیرمـانەوە هـاتبوو. زۆر بەگەرمـی پێـشوازی لێکـردینو رێنـوێنی کردین هەتا ناو دێیەکەو لەوێـش بـۆ دیوەخـانی حەمە ڕەشـیدخانی خــوالیبــوردوو، رۆژەکە بــاران بــوو؛ هەمووەمـــان تەڕ بووبـــووینو هەندێکمان (منیش یەکێک لەوانبـووم) سـەبارەت بەشـڕی پێڵاومـان هەموو پێیەکانمان قوڕاوی بووبوون. بۆیە کە خان لەدیوەخان هـاتە دەرو پێشوازی گەرمی لێکردینو پاشان دەستی منی گـرت بەرامـبەر ژووری دیوەخـانەکەی کە مـافوری (فەرشــی) نایـابی ئێرانــی تێـدا راخرابوو، من رووم نەهات بەو تەڕیو پێقوڕاویەوە بچینە ژوورەوە، بـۆیە داوای لـێبـووردنم لەخـان کـرد کەڕێگەمـان بـدات بچیـنە مزگەوت قاچمـان بـشۆینو خۆمـان وشـک بکەیـنەوە ئنجـا بێیـنەوە، بەڵام خوالێخۆشبوو حەمەڕەشید رازی نەبـوو، ئەمـری کـرد مەسـینە ئامادەکرانو قاچمان لەبەر شوشتو ئێمەی ناچار کرد بچیـنە ژووری دیوەخـانە گەرمو گـوڕو رازاوەکەیەوە! لەوێـش هەم خۆمـان وشـک کردەوەو هەم خۆمـان حەسـاندەوە. مەجیـد خـانی خوالێخۆشـبووش هەر لەدەرەوەی دێیەکەیـــانەوە کە ئـــێمەی بەو وەزعە دیتبـــوو،

سـوارێکی نـاردبوو بـۆ پێنجـوێن لەوێ پتـر لەسـەدو پەنجا جـووت پێڵاوی راسپاردبوو بۆمان کڕابوو، شەو پێمان گەیشتو بەسـەرماندا دابەشکران.

خـــانیش منـــی خەڵات کـــرد بەشـــاڵێکی باشـــی کـــوردیو بەدەستکێشێکو قەمسەڵەیەک. لەدیواخانەکەشیا خزمەتێکی باشیان کردینو خـواردنێکی شـاهانەیان بـۆ هێنـاین، چەنـدین جـۆری پـلاو، گۆشت، شلەی کوردیو ئێرانی بۆمـان سـازکرابوو، منـیش کوڕەکـانم هانداو لەوەرامی داوای خاندا کە وەک ماڵی خۆمـان رەفتـار بکەیـنو شەرم نەکەین لەخواردنـدا؛ بە پێـشمەرگەکانم گـوت کە چـێ گیڤـارا دەڵـێ (پێـشمەرگە خـواردنی باشـی لـێهەڵکەوت ئەبـێ زۆر بخـوات، نەک هەر تێربخوات، چونکە رۆژی واشی دێتەڕێ کەخواردنی دەست نەکەوێت)؛ بۆیە هانم دان خۆم ئاسایی تێر بخۆنو زۆر بخۆن!

خان زۆر رێزی لێگرتینو پـێی راگەیاندین کە ئەنوەر بەگی کوڕی بەدەیـان چەکـدارەوە ئامـادەکردووە بـۆ هاوکـاری کردنمـانو راشـی سـپاردووە هەرچـی سـەرۆکو پیاومـاقوڵێکی هەیەو خـۆی بەکـورد بزانێت دەبێ هاوکارمان بێت.

دوای نـان خـواردن خـان بەجـێی هێـشتین تـاکو بحەسـێینەوە، بەڵام خوالێخۆشبوو مەجیدخانی دۆستم مایەوەو مـوژدەی پێـدام کە هەمـوو ئەرکەکـانی خـۆی بەدیهێنـاوەو چەنـد سـەد چەکـدارێکی عەشایری ئامادەکردووە بـۆ بەشـداربوون لەگەڵمـان بـۆ رزگـارکردنی پێنجوێن. بەیانیش تاخۆمـان سـازدا نـانێکی نایـابی بەیانیانمـان بـۆ سـازدرابوو. مەجیـدخانی دۆسـتم هـاتبوو بـۆ هانـدانمان بـۆ زۆر خـواردن، لەگەڵ خۆشـیدا کـوڕێکی مێرمنـداڵی ژیـکەڵەی خـۆی هێنابوو، کە زۆر بەڕووخۆشییو بەپەرۆشـەوە دەیویـست پێـشمەرگە

ببینێتو من بدوێنێت! منیش زۆرم خۆش ویستو ئاواتم بۆ خواست کە لەدوارۆژدا ئەویش ببێتە پێشمەرگەیەکی قارەمان. ئەو کۆرپەیەی مەجیدخان ناوی بەختیار بوو زیرەکو وریا دەهاتە بەرچاوم، رووخۆشو گەش بوو. کەچی زۆر بەداخەوە ئەو رۆڵەیەی مەجیدخانی دۆستی دێرینم لەساڵی 1977دا بەدەستی پێشمەرگەیەک سەبارەت بەچاک لەیەکتر نەگەیشتن کوژرا، کە بەراستی سەرکردایەتی ی.ن.ک-یش نەئاگای لێبوو نەپێشی باشبوو، بەپێچەوانەوە زۆریشمان پێناخۆش بوو؛ تەنانەت پاشان نامەم بۆ خوالێخۆشبوو مەجیدخان نووسیی‌و داوای لێبوردن‌و لێخۆشبوونم لێکردو پێم راگەیاندن کە ی.ن.ک بەختیاری جوانەمەرگی کوڕی بەرۆڵەی خۆی‌و شەهیدی خۆی دادەنێ. ئەویش زۆر پیاوانە وەرامی دایەوەو داخەکە هەر ئەوەبوو کە بەو شێوەیە کوژراوە.

رۆژگاری ناهەموار مەجیدخانی بەر پاڵەپەستۆی لافاوەکانی خۆی دابوو، لەدیوی کوردستانی ئێراندا خۆی دیتبۆوە، لەوێش بۆردومانی دڕندانەی تۆپخانەو فڕۆکەی عیراق بوونە هۆی شەهیدبوونی چەند کوڕێکی تری، تاوای لێهات بەناوی باوکی شەش شەهید لەئێراندا ناوبانگی دەرکرد.

هەزار رەحمەت لەگیانی کوردانەی مەجیدخانی خوالێخۆشبوو.

سەروەری بۆ هەموو شەهیدانی کوردەواری‌و کوردایەتی.

ژمارە (**2083**)، رۆژ (**2000/2/26**)

# سەرهەنگ، خەباتگێڕێکی شۆڕشگێڕ و گوڵناس

خەباتگێڕی دلێر ئیسماعیل سەرهەنگ لەچلەکەیدا چەندین بیرەوەریمان دێنێتەوە یاد، ئەو رۆڵە تێکۆشەرە لەکوردستانی تورکیاوە هاتووە بۆ کوردستانی عیراق. هەرلەسەرەتای لاوێتییەوە بەبیروباوەڕی کوردایەتیو خەباتی شۆڕشگێڕانە فرچکی دراوەو مێشکی زاخاودراوە. هەربۆیەش هەرلەمەکتەبی (دار المعلمین)ەوە چۆتە کۆڕی تێکۆشەرانو لەحزبی رزگاری کورداو پاشان لەپارتیدا وەک ئەندامێکی چالاکو بەجەرگ خەباتی کردوە.

واتە ئەو جوامێرە، هەرلەسەرەتاوە، بەرێبازی شۆڕشگێڕانەی کوردایەتیو حزبایەتیدا، شانی داوەتە بەرئەرکەکانی خەبات. لەناو مامۆستایانو لەناوکۆمەڵانی خەڵکدا بێوچانو بێسڵەمینەوە لەدوژمنانو ناحەزان خەباتی کردوە بۆ هۆشیارکردنەوەی مامۆستایانو خوێندکارانو خەڵکەکەو راهێنانیان بەخەباتی حزبایەتی. واتە ئەوخەباتگێڕە هەرلەسەرەتاوە باوەڕی بەخەباتی رێکوپێکو حزبایەتی هەبووە، نەک بەشێوە کۆنە خێڵەکییەکەی کوردەواری. هەربۆیەش هەرلەسەرهەڵدانی چالاکییە شۆڕشگێڕانەکانەوە، خۆی گەیاندە شاخو بووە کادرێکی سیاسی ژیرو هۆشیاری ناو (ە.پ.ک).

جگەلە کاروباری سیاسیو ڕێکخستنو هۆشیارکردنەوەش لەناو (ە.پ.ک)دا ئەرکێکی زۆربایەخدارو گرنگی گرتەئەستۆ، ئەویش ئەرکی حەل کردنی شیفرەکانی میری عیراق بوو، هی عەسکەریو ئیداریو هتدیان. لەو کۆڕەشدا بووە بەشۆڕەسواری شۆڕش. بەوەش کەڵکێکی زۆر زۆری بەشۆڕش گەیاندو دەورێکی دیارتریشی هەبوو لەئاشکراکردنی پلانە عەسکەرییەکانی دوژمنو ئاگادارکردنەوەی (ە.پ.ک) لێیان بۆ خۆسازدان بۆ بەرەنگاربوونەوەیان.

سەرهەنگ پێشتریش گیاناسو گوڵناسێکی شارەزابوو. چەندین گوڵ و گیای بۆ یەکەمجار لەشاخو دۆڵەکانی کوردستاندا دۆزیوەتەوەو بەناوی خۆیەوە لەفەرهەنگی گوڵوگیاناسیدا تۆمارکراون. کەئەمەش خۆی لەخۆیدا خزمەتێکی بێوێنەیە لەوبوارەداو تائیمڕۆش لەکوردستاندا هەرخۆی تاکە شورەسواری ئەو کۆڕەیە.

وەک ئینسان سەرهەنگ خەباتگێڕێکی مەبدەئی بوو. پێشکەوتنخواز. باوەڕی بەخەباتی هاوچەرخی شێوە نوێ هەبوو. باوەڕی بەحزبایەتیو سەرەتاکانی حزبایەتی هەبوو. جگەلەوە پیاوێکی سادەی، خاکی، جەماهیری، خۆشەویست بوو. زوو دەچووە ناودڵی ناسیاوەکانیەوە. پیاوێکی بێتەماحو خۆنەویست بوو، بەجۆرێک کەدەتوانین بڵێین کەیەکێک بوو لەخەباتگێڕە گومناوەکانی کوردایەتیو شۆڕش.

بەڵام لەدڵودەروونی ناسیاوەکانیدا، لەدڵودەروونی هەڤاڵەکانیدا، لەمێژووی راستەقینەی خەباتی گەلەکەماندا جێگایەکی دیاری هەبوو.

ئەوجوامێرەش بۆ کوردایەتی ژیاو لەخەباتەکەیدا تواوەوە
هەربەو سەربەرزییەش ماڵئاوایی لێ کردین.
هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی

ژمارە (**2132**)، ڕۆژ (**2000/4/29**)

## بانگەوازێك لەمام جەلالەوە
## بۆ هاوكاریكردنی منالآنی شەهیدانی كوردستان

خوشكو برا خۆشەویستەكانی كوردپەروەر لەدەرەوەو ناوەوەی كوردستان، بەسلاوێكی برایانەی گەرمەوە تكاتان لێدەكەم؛ ئاورێكی دلسۆزانە بدەنەوە لەمنالآنی شەهیدانی كوردستان، چ ئەوانەی لەشۆڕشدا شەهید بوون، یان لەزیندانەكاندا كوژراون، یان بەر هەلمەتی ئەنفال كەوتوون، شەهیدانی هەموو كوردستان لەزاخۆ تا خانەقینو بەدرە.

بێگومان هەموو ئەوانەی پەرۆشی كوردایەتیو دواڕۆژی كوردستانیانە، پێویستە بیر لەمنالآنی شەهیدان، لەژیانو گوزەرانو خوێندنو تەندروستییان بكەنەوە، نەك هەر لەبەرئەوەی ئەوانە منالی دلسۆزترینو فیداكارترین رۆلەی كوردو كوردستانن، كەقەرزیان، كەچاكەیان بەسەر هەموومانەوە هەیە، بەلكو لەبەرئەوەش؛ كەئەوانە رۆلەی دواڕۆژ دەبن، بۆیە پاراستنی تەندروستییانو پەروەردەكردنیانو پێخوێندنیان كار دەكاتە سەر دواڕۆژی گەلەكەمانو پێكهاتەی كوردەوارییەكەمان.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش، هاریكاریكردنی منالآنی شەهیدان ئەركێكی پیرۆزی نیشتمانیو ئینسانیو ئایینی سەرشانی هەموو لایەكە. دەبا ئەوانەی لەدەرەوەن قۆلو بازووی جوامێری

لێهەڵکەنو هەریەکەیان بە (10-15)دۆلار منداڵێک بەخاوەن بکەن. دەبا ئەوانەی لەناوەوەشن بەپێی توانایان یارمەتی منداڵانی شەهیدان بدەن.

دەبا هەمووومان پێکەوە مشووری منداڵانی شەهیدان بخۆین.

دەبا هەردوو حکومەتەکەی کوردستانیش، بودجەی پێویست تەرخان بکەن بۆ ژیانی کەسوکاری شەهیدان، بەدروستکردنی باخی منداڵانو پێخوێندنی منداڵانی شەهیدانو پەروەردەکردنیان.

منیش چاوەنواڕی هیمەتی دڵسۆزانەتانمو هەر بژین بۆ

**برای دڵسۆزتان**

**مامجەلال**

ژمارە (**2471**)، ڕۆژ (**2001/6/5**)

# لەپێناو بەرگری کردن لە مافەکانی هەردوو نەتەوەی برا تورکمان و ئاشوری

وەک هەر کوردێکی پێشکەوتنخواز هەست بە ئازاردەکەم گەر مافە نەتەوەیی و ئیداری و رۆشنبیرییەکانی هەردوو نەتەوەی برا تورکمان و ئاشوری، بەدارێژراوی و بەرجەستەکراوی لە چوارچێوەی یاسا کوردستانیەکاندا نەبینم هەروەک بە نەبوونی بەڕێوەبەرێتی تایبەت بۆ بایەخدان بەمافە رۆشنبیری و ئیداری و نەتەوەییەکان ناڕەحەت دەبم. هەردوو نەتەوەی برای گەلی کورد.. نەتەوەی ئاشوری و نەتەوەی تورکمان بە درێژایی چەندان سەدە لەسەریەک خاکی هاوبەش لەگەڵ گەلی کورد ژیاون و پێکەوە لەتاڵی و شیرینیدا هاوڕێ و هاودەم بوون لە رابردوی دووردا لەگەڵ گەلی کورد پێکەوە لەژێر جەورو ستەمی داگیرکەرو زۆردارانـدا ناڵاندویانەو پێکەوەش کەوتوونەتە بەر شاڵاوی دڕندانەی عەفلەقیە شۆڤینستەکان کەوتوونەتە بەر تاوانی ئەنفال و راگوێزان و دەربەدەرکردن و بە زۆر بە بەعسی و بەعەرەبکردن. خوێنی تێکۆشەرە ئاشوری و تورکمانەکان لە مەیدانی نەبەردی هاوبەشی دژ بە دیکتاتۆری و لە پێناوی دیموکراسی و مافی مرۆڤدا ئاوێتەی خوێنی برا تێکۆشەرە کوردەکانیان بووە ئێستاش کە نزیکەی نیوەی کوردستانی عیراق لە دیکتاتۆری ئازادکراوەو

ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان هەڵبژێردراوەو حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزراوە، چیبکەین بۆ ئەوەی برا ئاشوریو تورکمانەکانمان بەگشت مافە نەتەوەییو ئیداریو رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو.. هتد کانیان شادبن؟!

بێگومان مسۆگەرکردنی یەکسانی تەواو بۆ سەرجەم کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەژێر سایەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا کارێکی چاکە، بەڵام هەرگیز ئەمە بەس نیە. هەروەها بەشدارکردنی برا ئاشوریەکان لە پەرلەمانو حکومەتدا کارێکی چاکە، بەڵام هەرگیز ئەمە بەس نیە. بەڵکو لە پاڵ مسۆگەرکردنی ئازادییە دیموکراتیەکان بۆ برا ئاشوریو تورکمانەکانو دابینکردنی ئازادیی کاری حیزبیو رۆشنبیریو سیاسیو نەتەوەیی بۆیان، پێویستە ئەم مافانەشیان بۆ دەستەبەربکرێ:

یەکەم: دەرکردنی چەند یاسایەک لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانەوە بۆدابینکردنی مافە نەتەوەییو ئیداریو رۆشنبیریەکانیانو قەدەغەکردنی چەوساندنەوەو جیاکاری (التمییز)، هەروەها قەدەغەکردنی هەر دەستدرێژیەک بۆسەر خاکو کاروباری تایبەتیو بیروباوەڕ.. هتد.

دووەم: دامەزراندنی بەڕێوەبەرێتی گشتی رۆشنبیری تورکمانیو بەڕێوەبەرێتی گشتیی رۆشنبیری ئاشوری بۆدابینکردنی مافە رۆشنبیریەکانیانو زامنکردنی خوێندنی زمانو مێژووی خۆیان لە خوێندگاکاندا.

سێیەم: گێڕانەوەی دەسبەجێی جوتیارە ئاشوریو تورکمانەکان بۆ گوندەکانی خۆیانو گێڕانەوەی زەویو زاریان، بۆ مسۆگەرکردنی ئەمەش بێسڵەمینەوە هێزی یاساو پۆلیسو پێشمەرگە بەکاربهێنرێ.

چوارەم: رۆژی یەکی نیسان بکرێتە جەژنێکی نەتەوەیی برا ئاشوریەکانمانو لەسەرانسەری کوردستاندا پشووی رەسمی بێت.

پێنجەم: دابینکردنی مافە ئاینییەکان بۆ سەرجەم برا مەسحیەکانو مسۆگەرکردنی ئازاییو خواپەرستی بۆیانو رێزگرتنی جەژنە مەسیحیەکانو کردنی بە جەژنی رەسمی. هەروەها پێشکەشکردنی کۆمەکو یارمەتی بۆ چاکردنەوەی کڵێساو پەرستاگاکانی تر.

شەشەم: لەو قەزاو ناحیانەدا کە زۆربەی دانیشتوانی تورکمان یان ئاشورین، فەرمانبەرە ئیداریەکان هەر لە خۆیان دابنرێن، هەروەها لەسەرجەم دایەرەو دامودەزگاکاندا فەرمانبەری تورکمانو ئاشوری دابمەزرێنو بۆ دامەزرانیشیان تەنها نمرەو کارامەیی نەکرێتە پێودانگ بەڵکو مەسەلەی زامنکردنی مافە ئیداریەکانیان رەچاوبکرێ، لەو حاڵەتەشدا هەندێکجار بۆ بەرژەوەندی ئەوان، رێسا کارپێکراوەکان فەرامۆشبکرێن.

حەوتەم: پێویستە رێزی نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانی ئاشوریەکانو نوێنەرانی حیزبە تورکمانەکان بگیرێو لە کاروباری دامەزرانو هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە مافە نەتەوەییو ئیداریو رۆشنبیریەکانیانەوە هەیە راوێژیان پێبکرێ.

ئەمانە هەندێک لەو داواکاریە بەپەلەو رەوایانەی برا تورکمانو ئاشوریەکانن کە پێویستە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانو ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان دەسبەجێ هەوڵی بەجێهێنانو دابینکردنیان بدەن.

من لێرەدا جارێکی تر ئەوەدووپات دەکەمەوە کە هەڵوێستی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بەرامبەر برا تورکمانو

ئاشوریەکان، سەنگی مەحەکی پێشکەوتنخوازیو دیموکراتی بوونی بزوتنەوەکەیە. ناشبێ هەرگیز سستیو خۆدزینەوە هەبێ لە سەلماندنو دابینکردنی مافە نەتەوەییو ئیداریو رۆشنبیرییەکانی برا ئاشوریو تورکمانەکاندا.

لێرەدا هاوکاری بێ سنووری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ دوو نەتەوە براکەی گەلی کورد، تورکمانو ئاشوری، دووبارە نوێ دەکەمەوەو داوا لە گشت رۆڵە دڵسۆزەکانی کوردستان دەکەم شان بەشانی ئەو دوو نەتەوەیە تێبکۆشن بۆ مسۆگەرکردنی گشت مافە رەواکانیان لە سایەی کوردستانی ئازادکراودا. دەنا گەر وانەکەین ئەوا ئازادیەکەمان سەرکەوتوونابێو بەرامبەر بەو گفتەیە وەفادارنابین کە دەڵێ: ئەو میللەتەی میللەتێکی دیکە بچەوسێنێتەوە، ناکرێ خۆی ئازادبێت.

سڵاو لەوکەسانەی رێی خەباتی بێوچان دەگرنەبەر لەپێناوی دابینکردنی تەواوی مافەکانی برا ئاشوریو تورکمانەکان لە هەرێمی کوردستانی فیدراڵدا.

ژمارە (**273**)، رۆژ (**1992/12/21**)

# چەند پێشنیازێك بۆ مشتومڕ لەسەرکردن

هەرچەنـدە مـن کـوردیزانێکی باشـنیم، بەڵام بەپێویـستی دەزانـم هەندێ تێبینی بخەمە بەرچاو کوردیزانە باشەکانمان بەتایبەتی کـاک نەوشـیروان مـستەفا کە چەنـدین زمـانی ئەوروپـاییو ڕۆژهەڵاتـیش دەزانێتو کاک شێرکۆبێکەسی شاعیری هەرەمەزنی گەلەکەمـان نەک هەر لە شـیعرا، بەڵکـو لە نوسـینو پەخشانیـشدا وەسـتایە،و کـاک حـسێن عـارفو کـاک مـحەمەدی مـوکری چیـرۆک نووسـە هەرە باشــەکانمانو چەنــدین نوســەری لاویــش کەشــوکر ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبوونن.

یەکەم: تێبینـیم لەسـەربەکارهێنانی وشـەی چەپـڕەو (لە جیـاتی یەساری عەرەبـی- left)ی ئینگلیـزیو هەروەهـا ڕاسـترەو لە جیـاتی (یەمینـی عەرەبـیو- rIght) ئینگلیـزی. مـن پێمـوایە ڕاسـتیەکەی چەپە لەجیــاتی یەســارو (left)و چەپــڕەو دەشــێ لە جیــاتی (توندڕەوی چەپ) بەکاربێت. هەروەها بۆ ڕاستەکەش.

دووەم: لەســـــەر دیموکراســـــیو دیمـــــوکراتو سۆشیالــــستو سۆشــــیالیزمو.. هتــــد. ڕاســـــتیەکەی دیموکراســـــی دەکــــاتە (دیموقراطیة)ی عەرەبیو (دیموکرات)یش دەکاتە (دیموقراطی). بۆ نمونە ئێمە دیموکراسیمان گەرەکە: واتە (نرید الدیموقراطیة)، بەڵام پیـاوەکە دیمـوکراتە (الرجـل دیمـوقراطی) مـن پێمـوایە ئەم دوو زاراوەیە لە زمانی فارسی باشـتر بەکاردەهێنـدرێن هەتـا لە نوسـینی

زۆربەی نوسەرانی کوردی لەلای خۆمان هەربەهەمان شێوەش سۆشیالیست دەکاتە (اشتراکی) عەرەبیو (سۆشیالیزم) دەکاتە (اشتراکیه)ی عەرەبی. هەروەها مارکسیتو مارکسیزمو.. هتد.

سێیەمین: زۆر وشەی کوردی جوانی خۆمان هەیە دەیگۆڕنەوە بە وشەی فارسی. من خۆم پێموایە زمانی کوردیو زمانی فارسی لەیەک بنەماڵەنو زۆریش لێک نزیکنو پێم باشە گەر وشەی رەسەنی خۆمانی نەبوو لە فارسی وەریبگرین. بەڵام توخوا جوان چی لە (قەشەنگ) کەمترە! یان تێپەڕبوون چی لە گوزەر کەمترە؟ یان رووناکبیری چی کەمترە لە رەوشەنبیر؟.

چوارەم: پێموایە ئێستە زمانی کوردی بەتایبەتی ئەوەیشی بەهەڵە پێیدەگوترێ سۆرانی کەلە راستیدا موکریانیە نەک سۆرانی زوو گەشەی کردووەو خۆی چەسپاندوەو ئیتر لە خەتەری هەڵلوشینو نەمان رزگاری بووە.

بۆیە دەشێ وشەی بێگانەش (ئەوروپایی، عەرەبی، فارسی، تورکی) لە جێی خۆیدا بەکاربهێنین گەر هی خۆمان نەبوو، یان وشەکەی خۆمان پڕبەپێستی مەقسەدنەبوو:

نازانم چ زیانێک لە وشەی رادیۆ، تەلەفزیۆن، ڤیدیۆ، سیمینار، فیستیڤاڵ (نەک ڤیستیڤاڵ کە بەهەڵەبەکاردێت)ن پێنگ پۆنگ دەبینین؟!.

پێنجەم: ناوی شارو وڵاتان لە کوردیدا هێندێ وڵات ناویان بەسەردابڕاوە. بۆ وێنە ژاپۆن (یابان)و چین (صین)و کەچی ئێستە بەجۆرێکی تر ناویاندەبەن.

ژمارە (**2088**)، رۆژ (**2000/3/2**)

# لەپێناوی زانکۆی کۆیەدا

شاری کۆیە کەشارێکی دێرینی کوردستانەو ناوچەیەکی گرنگی زانیاری ئیسلامیو ئەدەبو هوشیاری کوردایەتی بووە، هەمیشە لەلایەن داگیرکەرانەوە بوغزێندراوەو هەمیشەش زەغتوپەلاماری جۆراوجۆری داگیرکەرانو حکومەتە کۆنەپەرستەکانی عیراقی لەسەربووە، بەڵام شاری کۆیە سەدان ساڵە خۆڕاگرو کۆڵنەدەرو نەبەزبووەو لەکۆڕی کوردایەتی رۆڵەکانی دەوری دیارو گرنگیان هەبووە، هەر بۆیەش حکومەتە کۆنەپەرستەکانی عیراق بەهەموو جۆرێک ویستوویانە بچووکی بکەنەوە، دوای بخەنو بێ بەشی بکەن لەپیشەسازیو هۆیەکانی شارستانی نوێ.

تەنها لەسایەی راپەڕینی پیرۆزی گەلەکەمان کۆیە وەک شار هێشتراوە ئەگینا پلانی گڵاوی رژێمی گۆڕبەگۆڕی صەدام هەڵوەشاندنەوەی کۆیەو سڕینەوەی شوێنەواریشی بوو.

لەسایەی حکومەتی هەرێمی کوردستانیشەوە کۆیە بووژاندنەوەو گەشەپێدانی بەرچاوی بەخۆیەوە دیوە، چ لەڕووی ئاوەدان کردنەوەو چ لەڕووی خوێندەوارییو چ لەڕووی بوارەکانی تەندروستییو کشتوکاڵەوە کۆیە گەشەکردنی دیاری بەخۆیەوە دیوە.

کۆیە خاوەن خەباتێکی دوورودرێژو پڕ لەسەروەرییو فیداکارییە، ژمارەی شەهیدانی لەچاو خۆی دەیخاتە ریزی پێشەوەی شارە شەهیدپەروەرەکانی کوردستان، بۆیە کۆیە هەقی بەسەر هەردوو

حكـومەتەكەی كوردسـتانەوە هەیە، هەقـی خـۆیەتی كەهەردووكیـان یارمەتی پێویستی بدەن لەهەمو روێكەوە، لەڕوی ئاوەدان كـردنەوەو پیـشەسازیو خوێنـدەوارییەوە بەتـایبەتی، بـۆ ئەمەش دوو شـت پێویستە بۆ كۆیە بكرێت:

1-یەكێكیان دامەزراندنی زانكۆیە لەكۆیە.

2-دروستكردنی پاڵاوتەیەكی نەوتو بەنزینە لەكۆیە.

با جارێ لەم وتارەدا لەسەر خاڵی یەكەم بدوێین:

زانكۆی كۆیە

ئێـستە لەكـۆیە دوو كـولیە هەن: كـولیەی پەروەردەو كـولیەی شەریعەتو یاسا.

لەتەكیانـا مەعـهەدی فەننـیش هەیە كەئەویـش دەشـێ وەك كولیەیەك رێزی لێ بگیرێو گەشەی پێ بدرێت تا دەبێتە كـولیە، وا حكومەتی هەرێم دوو بینایەی بـاش بـۆ دوو كـولیە دروسـت دەكـات لەگەڵ چەندین هۆڵو ئەپارتمانی نیشتەجێ بوون، بۆیە من پێـشنیار دەكەم كە:

1-حكومەتەكانی هەرێم دوو كولیەی تریش لەكۆیە دروست بـكەن لەگەڵ بەشەكانی ناوخۆ بۆ خوێنـدكارانو ئەپارتمەنەكـانی پێویـست بۆ مامۆستاكان.

2-دوو كولیەی تریش بكرێنەوە لەكۆیە یەكێكیـان هـی كـشتوكاڵ بێـتو ئەویتـریش هـی هەندەسـە بەبەشـەكانی جیولـۆجیو نەوتو رێگەوبانیشەوە.

3-بەم جـۆرە (5) كولیەمـان دەبێـت لەكـۆیە، دەبـنە بنچیـنەی زانكۆی كـۆیەو سـاڵ بەسـاڵیش كـولیەی تریـان بخرێتەسـەر بەپێـی پلانێكی چوار ساڵانە كەئیتر ببێتە زانكۆیەكی تەواو.

4-داوا لەدەوڵەتەکانی دۆستو ڕێکخراوە خێرخوازەکان بکرێت بەشداری بکەن لەدروستکردنی بیناکانی زانکۆی کۆیەو دابینکردنی موختەبەرو ئەمرازە پێویستەکانیتر بۆ زانکۆی کۆیە، لەدواییدا من دڵنیام لەوەی کاکە بەرهەمی سەرۆکی وەزیرانی هەرێمی کوردستان کە لەسەرێکەوە بەکۆییش حسابەو خۆشی ئەهلی علمو دانشو زانینە، بەگەرمی بەپیر ئەم داوایانەمانەوە دێت.

هیواداریشم کە کاکە نێچرڤانی بارزانیش کە بێگومان ئاگاداری بەشداری کۆییە خەباتگێڕەکانە لەپارتیو شۆڕشی بارزانو شۆڕشی ئەیلوولدا، ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێبهێنێتو پێشوازی گەرم لەداخوازییەکەمان بکات.

دەبا هەردوو حکومەتەکەمان هەوڵی پێویست دەستپێبکەن بۆ بنیاتنانی زانکۆی کۆیە.

ژمارە (**3182**)، ڕۆژ (**2003/9/28**)

## دەربارەی خوالێخۆشبووان
## سەعیدی تەتەرو سەعیدی حەمەی قالەی بێستانچی

کاک کەمال عەبدوڵڵاهی، لەکتێبە نایابەکەیدا (سێبەری ئازادی) هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ناساندنی کاک سەعیدی حەمەی قالەی بێستانچی و وێک چوونیان یا یەکبوونیان لەگەڵ کاک سەعیدی تەتەر.

منیش چونکە نەختێک ئاگام لە کاک سەعیدی تەتەرو کاک سەعیدی حەمەی قالەی بێستانچی هەبوو کە لەلای کەڵە پیاوی ناوداری کورد کاکە زیادی حەماغا-ی کۆیە گیرسابۆوە، بەناوی مامە قالەی باخچەوان، بۆیە لێرەدا دەمەوێ ئەم ڕاستییە دەربخەم کە ئەو دوو جوامێرە یەک کەس نین، بەڵکو دوو تێکۆشەری نەبەزی ڕێگەی ڕزگاریی و دیموکراتی خەڵکی کوردستان بوون.

خۆم شاهێدی حاڵم: هەردووکیانم ناسیوەو لەیەک ساڵدا هەردووکیانیشم دیوە. بۆیە بەسەربەستییەوە دەڵێم کە:

1. کاک سەعیدی تەتەر، ڕۆڵەیەکی جوامێری کوردستانی عیراق بوو، ناوەکەی خۆشی (مەسعود) بوو. نازناوە حزبییەکەی سەعید بوو. بۆیە مامۆستایانی خوالێخۆشبوو برایم ئەحمەد و هەمزە عەبدوڵڵا و نوری شاوەیس ڕاستییەکەیان گوتووە، کە ئەو جوامێرە خەڵکی کوردستانی عیراق بوو. بە ناوەکەشیدا (مەسعود) دەبێ لە بنەماڵەیەکی دینی بووبێت یان کوڕە مەلا.

ئەم کـاک سـەعیدە، پیـاوێکی جـوامێری لێهـاتووی بەتوانـاو جەربەزەو نەترس و بەجۆش و خرۆش و تین و گورِ بـوو. مـن لە سـاڵی 1949دا بـۆ یەکەم جـار لە کـۆیە ناسـیم. کە تەتەری مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا-ی سکرتێری ئەوێ ڕۆژێی پـارتی بـوو، نـامەیەکی لەوەوە بـۆ لیـژنەی نـاوچەی کـۆیە هێنـابوو، لەگەڵ وەڵامێکـی نـامەیەکی مـن بـۆ مامۆسـتا هەمـزەی خوالێخۆشـبوو. ئەوسا من ئەندامی لیژنەی ناوچەی کۆیە بووم، بۆ شـەویش کـاک سـەعید تەتەرِم بـردەوە مـاڵی خۆمـان. مـن پێـشتر ناوبـانگی خەبـاتگێرانەی ئەم جـوامێرەم لە مامۆسـتای خوالێخۆشـبوو حەمەدەمین مەعرووف و کاک عەلی عەبدوڵلا بیـستبوو. بـۆیە زۆر شـادبووم بە دیـداریی، شـەو تـا درەنـگە سـاتێ بەدیـاریەوە دانیـشتبووم. لە وەڵامـی پرسـیارەکانی منـدا باسـی ئەوەی بـۆ دەکـردم چـۆن تەتەری نێـوان ژەنەڕاڵ بـارزانی نەمـرو مامۆسـتا هەمزەی خوالێخۆشبوو بووە، چۆن هەرچەندە ڕێگە سـەخت بـووە بەزستان، بەڵام هەر دوانەکەوتووە لەکاری خۆیدا.

ئەم جوامێرە تا جیابوونەوەی باڵی کـاک هەمـزەش لە پـارتی لە سـاڵی 1951دا، هەر مـابوو. لە گەشـتەکەی سـاڵی 1954ی کـاک هەمزەدا بۆ ئێران بەرەو سۆڤیەت، لەگەڵی بووەو ڕاستیشە چـووەتە لای خوالێخۆشبوو دکتۆر جەعفەر محەمەد کەریـم ڕەحمـانی. ئەوسـا کاک سەعیدی باخچەوان لەکوردسـتانی عیـراق لەشـاری کـۆیە بـوو. پاشان ماوەیەک ون بوو، لە دواییدا زۆر بەداخەوە بـۆم دەرکەوت لە قەڵای جولَنـدێ-سوورقاوشـانی چەمـی ڕەزان، تـی ئـێن تـی، پیـاتەقیوەتەوەو وەفـاتی کـردووە. ئەم خەبەرە ناخۆشـەم وەختـێ بیست کەچووینە چەمـی ڕەزان لەسـەرەتای هەڵگیرسـانی شۆڕشـی

ئەیلوولـداو کردمـان بە بـنکەی خۆمـان. لە سـۆراغی دەوروبەرو ئەشکەوتەکانی ناوچەکەدا ئەو خەبەرە ناخۆشەمان بیست.

2. کەچـی مـامە قـالەی بـاخچەوان، ئەو زاتەیە کە کـاک کەمـال خۆشی باسی وەفاتکردنی دەکا لە ڕانیە. ڕاسـتە لە کـۆیە بـوو وەک بـاخەوان بـۆ حەشـاردانی کـاری دەکـرد، ئەگینـا کـاکە زیـاد ئاغـای ڕەحمەتی وەک تێکۆشەرێک ڕێزی لێ دەگـرت و لەگەڵ ئێمەومانـانی پارتیش خەباتی دەکرد.

ئـێمە کە ماڵمـان بەتەنیـشت مـاڵی کـاکە زیـاد ئاغـای ڕەحمەتـی یەوە بوو-ماڵەکەی حەماغای خوالێخۆشـبووی بـاوکی- لەگەڵ مـامە قالە بووبوینە دۆست و منیش کە زانیم لە مەهابادەوە هاتووە، زۆرم ڕێز لێ دەگرت و پێکەوەیش پارتایەتیمان دەکرد. لە هەمـان سـاڵی 1949دا کە کاک (سـەعیدی تەتەر)م ناسـی پـێکەوە پارتایەتیمـان دەکـرد. ئەو مـامە قـالە جـوامێرە، پیـاوێکی باهۆشـی ژیـرو مەنـدو لەسـەرەخۆ بـوو، لە کـۆیە هەرچـی دەیناسـی ڕێـزی لـێ دەگـرت. چەندین مناڵی هەبـوون، لەوانە کـاک دکتـۆر خەسـرەوی لێپرسـراوی ئێـستەی مەڵبەنـدی یەکێتیـی نیـشتمانیی کوردسـتان لە ڕانـیە. لە ڕووی بیچمیشەوە پێک نەدەچوون. کاک سەعیدی تەتەر، پیـاوێکی کەتەی بە خـۆوە بـوو، بـاڵای بەرز بـوو، کەچـی مـامە قـالەی باخچەوان، پیاوێکی خنجیلانەی باڵا مـام نـاوەنجی بـوو. ئیتـر هەزار ڕەحـمەت لە گیـانی پـاکی ئەو دوو ڕۆڵە دلێـرەی کـوردایەتی کە بەناویش پێکەوە گرێدەری خەبـاتی هەردوو پـارچەکەی کوردسـتان بوون.

دیـارە مـن نـازانم کە ئەو کـاک سـەعیدی تەتەرە کە پـێم وایە لەسەر تەریقەتی هەقەش بوو، ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر مەهابادی

سەربەرزو پـر سـەروەر یـان نـا. بەڵام لەم ڕاسـتییە دڵنیـام کە ئەو کـاک سـەعیدە، کە نـاوە ئەسـڵییەکەی (مەسـعود) بـوو، ئەو کـاک سەعیدی حەمەی قالەی بێستانچی تێکۆشەرە دلێرە، نەبوو، بەڵکوو دوو تێکۆشەری ئازاو نەبەزو بە تواناو بەوەج بوون.

ژمارە (**4789**)، ڕۆژ (**2009/2/5**)

# ڕوونکردنەوەیەکی پێویست لە "مام جەلال"ەوە

بنکەی ژین کە دەزگایەکی ڕووناکبیریی چالاک و خەمخۆری بابەتە مێژوویی و هۆشیاریی و ئەدەبییەکانی کوردە، کتێبێکی بەناوی "بیرەوەرییەکانی سەیید عەزیزی شەمزینی" بڵاوکردۆتەوە کە لە ئامادەکردن و ساغکردنەوەی کاک "محەمەدی حەمە باقی"ە.

لە سەرەتادا ئەو هەوڵەی بنکەی ژین جێگای دەستخۆشی و نرخاندنە لەپای ئەو ڕاستییەی کە مامۆستای خوالێخۆشبوو سەیید عەزیری شەمزینی وەک تێکۆشەرێکی دێرین و خەباتگێڕێکی کوردستان دەهێنێ ژیان و تێکۆشانی بەرچاوی خۆی و بنەماڵە ناودارو ناسراوەکەی ڕووناکی پێویستی بخرێتەسەرو نەوەی ئەمڕۆی پێ ئاشنا بکرێ، بەڵام لە کتێبەکەدا بەهەڵە دوو نامە بەناوی (دوو دەستنووسی دوو نامەی مام جەلال) لە لاپەڕەکانی (126و 127)دا بڵاوکراوەتەوە کە لەڕاستیدا ئەو دوو دەستنووسە هی براو هەڤاڵی خۆشەویستمان کاک د. کەمال فوئادن و ئیمزای ئەویان بەسەرەوەیەو نامەی من نین.

بۆیە دەبوایە بنکەی ژین و کاک محەمەدی حەمە باقی هەندێ وردتر مامەڵەیان لەپاڵ ئەو مەسەلەیەدا بکردایە، بەتایبەتی کە ئەو بابەتە پەیوەندیی بەمێژووی درەوشاوەی میللەتەکەمانەوە هەیەو

دەچنە قاڵبی نووسینەوەی مێژووەوە.

لەبەر ئەو ڕاستییەو بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بابەتە مێژووییە، ئەو ڕوونکردنەوەیەمان بەپێویست زانی، لەگەڵ دەستخۆشی دووبارەم بۆ بنکەی ژین کە گرنگی تایبەت بەمێژووی سەربەرزانەی گەلەکەمان و ئەدەب و کلتوورو لایەنە هۆشیاریی و ڕووناکبیرییەکانی دەدات و لەو بارەیەشەوە جێ پەنجەی دیارە.

هەر شادو سەربەرزو سەرکەوتوو بن.

**مام جەلال**

**2011/10/20**

ژمارە (**5612**)، رۆژ (**2011/10/21**)

# بۆ/ كوردستانی نوێی خۆشەویست

سڵاوێکی گەرم

تکـــــایە ئەم روونکـــــردنەوەیەم بە نـــــاوی (ی.ن.ک)ەوە بـــــۆ بڵاوبکەنەوە:

1-چەند جارێکە رۆژنامەکەتان لە رێبازی ی.ن.ک دەردەچێت کە ئێمە پێی زویر دەبین.

2-سەروتاری رۆژی 1992/10/14تان زۆر ناڕاست و نـاڕەوایە. جارێ بڕیارەکە هی برای بەڕێز د.فوئاد نەبـووە، بەڵـکو هـی هەمـوو ئەنجـومەنی وەزیـران بـووە. پاشـان پەرلەمـان دژی نیـیە، بەڵـکو ناکۆکییەکی فەننی بچووک هەبووە کە توانیمان چارەی بکەین.

بـۆیە بـرین کولانـدنەوە دژی گیـانی برایەتـی و هاوکـاریی نێـوان پارتی و یەکێتییە.

3-ی.ن.ک زۆر ناڕازییە لەو شێوەی وتارەکەی پـێ نوسـراوە، کە زۆر دوورە لە گیـانی ئەو هاوکـارییە سـتراتیژییەی نێـوان پـارتی و ی.ن.ک.

بەداخەوە ناچارتـان کـردم بە نـاوی (ی.ن.ک)ەوە ئەم راسـتییە بخەمەڕوو، چونکە وا چەنـدین جـارە لاسـارییەک لە رێبـازی ی.ن.ک رەچاو دەکەم کە ئێمە ئامادەنین چیتر قبووڵی بکەین.

**مام جەلال**

**سکرتێری گشی (ی.ن.ك)**

ژمارە (**216**)، رۆژ (**1992/10/15**)

# ڕوونکردنەوەیەك

هەڤاڵ سەرنووسەری کوردستانی نوێی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

تکـــایە لە یەکەمـــین ژمـــارەی داهـــاتووی خۆتانـــدا ئەم ڕوونکردنەوەیەمان بۆ بڵاوبکەنەوە کە بیروڕای ی.ن.ک دەردەخات.

لە ژمارە (297)ی ساڵی دووەمی ڕۆژی هەینی 1993/1/22 لە لاپەڕە سێدا، وتارێک بڵاوکراوەتەوە لە ژێر ناونیشانی (لە یادی دامەزراندنی کۆماری مەهابادا)-بە ناوی کوردستانی نوێوە- لەو وتـــارەدا لادانێکـــی ڕوون و ئاشـــکرا لە ڕێبـــاز و سیاســـەت و دروشـمەکانی ی.ن.ک بەدیدەکرێ، ئەوەنـدە سـەیرە گەر پیـاو لە نیازپاکی گومان بکات دەبێ بە گێرەشێوێنی بدرێتە قەڵەم یان بە ئـاو کـردنە ئاشـی پڕوپاگەنـدەی دوژمنـانی بـزانین. ئەویـش بەم جۆرەیە:

لە دوو شوێندا باسی سەربەخۆیی کراوە وەک دروشم و ستراتیژ کەچـی لە ڕاسـتیدا سـتراتیژی جـوڵانەوەی دیمـوکراتیی خەڵکـی کوردسـتان خـوی لە مـافی چـارەی خۆنووسـیندا دەنوێنێـت، کە ئەویش بە چەندین شێوە دەشێ بەکاربهێندرێت.

وتـارەکە دواییەکەشـی بەوە دەهێنـدرێت کە ئـاوات دەخـوازێ بـۆ ((کوردسـتانێکی سـەربەخۆ)) کەچـی دروشـمی ئـێمەی ی.ن.ک و بەرەی کوردستانی، فیدراڵە لە چوارچێوەی عیراقێکی دیموکراتدا.

ئەوە پڕوپاگەندەی دوژمنانی دیموکراسی و کوردستانی فیدراڵە کە دەیانەوێ مەسەلەکەمان بە جیابوونەوە بدەنە قەڵەم، بۆیە بە توندی رەخنەتان لێ دەگرم.

بۆ پێشەوە... رووەو سەرکەوتن.

**مام جەلال**

**سکرتێری گشتی ی.ن.ك**

**1993/1/23**

ژمارە (**298**)، رۆژ (**1993/1/24**)

## باشە! چۆن ئەزی تێدا شەرمەزار نەبم؟

جارێکیان رەخنەم لە نووسەرانی کوردستانی نوێی خۆشەویست گرتبوو لەسەر (کەمیی زانیاری) و (وردنەبوونەوە لە بڵاوکردنەوەی وتار و دەنگوباسدا) کەچی زۆربەی نووسەرەکانی لێم زوویر بوون و تەنانەت خوشکێکمان یەخەی گرتم و گوتی تۆ توندی لە وەرامدانەوەماندا لەسەر ئەو زاراوەی کە ئەمجارەش بەکارمهێناوەتەوە (ئەزی تێدا شەرمەزارم).

بەڵێ، دیسان دەیڵێمەوە لەسەر هەندێ شتی کە لە کوردستانی نوێدا بڵاودەکرێتەوە، ئەزی تێدا شەرمەزارم، چونکە نیشانەی ئەوەن کە نووسەرەکان یان بێباکن و ناگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکانی مێژوو یان زۆر شاش و درشتن لە چاپکردندا.

وا (3) نموونەتان بۆ باس دەکەم:

1- هەڤاڵێکمان دەنووسێ کە شێخ عبیداللە نەهری دژی (دەوڵەتی عوسمانلی و سەفەوی..). هەموو کەس، ئەگەر کەمێ لە مێژوو ئاگاداربێت کە زۆر دەمێکە سەفەوی نەماوە و پاشان نادر شا هاتووە و پاشان قاجار هاتووە و پاشان پەهلەوی. ئەو سەردەمەش سەردەمی قاجارەکان بووە.

2- لە وتارە نووسراوەکەی مندا بە دەستخەتی خۆم تەنها شەهید عیززەت عەبدولعەزیزم بە کولونیلی روکن ناوهێناوە پاشان بە تەلەفۆنیش قسەم بۆ کردن لەسەر یەکە یەکە لەو ئەفسەرانە.

کەچی لەقەبی روکن دراوە بە کاک بەکر حوێزی و نەمران میرحاج و مستەفا و سەید عەزیز و هتد!.

نازانم چۆن دەبێ ئەوەندە لە مێژووی خۆمان، مێژووی شەهیدانی نەمری سەردەمی خۆمان نەک سەدان ساڵ لەمەوبەر وا بێ ئاگابین؟

3-لە وتارەکەی مندا لە رێورەسمی کردنەوەی ناوەندی رووناکبیریدا کە من لەبەر چاوی دەیان کەس قسەم کردووە بە ڤیدیۆش وێنەی گیراوە و تەسجیل کراوە، وا نووسراوەتەوە:

(کە دوژمنانی گەلەکەمان بە پەنجا فڕۆکە سەدان، هەزار تانک ژیانی مەرگیان بەسەر شاری خنجیلانە و قارەمانی هەڵەبجەدا باراند). ئەمە لەجیاتی (تەن نەک تانک و ژەهر نەک ژیان).

دواییەکەی وتەکەشم وا نووسیوەتەوە: (ئێوەش ئەی خوشک و برایان هەمیشە هەشارد و سەربەرز و سەرکەوتووبن) لەجیاتی هەرشاد و..هتد.

جا توخوا، تو ویجدانی زیندووتان، هەڤاڵانی نووسەری کوردستانی نوێ ئەزی تێدا شەرمەزار نەبم؟ ناهەقمە؟ تووڕەبوونە یان راستی گوتنە؟ ئێوەش خۆتان و خوای خۆتان!

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

1999/3/18

ژمارە (1826)، رۆژ (1999/3/21)

# نامەیەکی پیرۆزبایی و
# ڕێنوێنی بۆ گەشەپێدانی کوردستانی نوێ

کوردستانی نوێی خۆشەویست

ئازیزانو خەباتگێڕانی نووسەرو کارگێڕ لەکوردستانی نوێدا

بەسڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرمەوە پیرۆزبایی یادی دەرچواندنی کوردستانی نوێ تان لێ دەکەم، لەخۆتانو لەخوێنەرەکانی ڕۆژنامەکەتانو لەهەموو هەڤاڵانی ی.ن.کو هەموو بیرڕووناکو هونەرمەندو خەباتگێڕانی ڕێگەی ڕزگاریو دیموکراسیو مافی مرۆڤ لەکوردستاندا.

دەرچواندنی کوردستانی نوێ لەدەیەی دوایی سەدەی بیستەمیندا کارێکی ڕاستو ڕەواو بەجێ بوو. بەپیرەوەچوونێکی ژیرانەی پێویستییەکی گرنگ بوو، هەروەک دەستپێشکەریو داهێنانێکیتری ی.ن.ک یش بوو لەبواری کەلتوریو سیاسییو هوشیاری نیشتمانیو دیموکراتییشدا. پێم وایە ئەرکی خۆشتان ئەنجام داوە. بۆ درێژەپێدانی دەرچواندنی کوردستانی نوێ ش لەچەرخی بیستو یەکەمیندا پێویستە گونجاو بێت لەگەڵ گیانی نوێی ئەم چەرخەدا، لەگەڵ پێویستییەکانی گەشەپێدانی هەمەلایەنەی ژیانو خەباتماندا.

پێم باشە وەک هەمیشە هەم ڕۆژنامەی ی.ن.ک بێتو هەم لاپەڕەی ئازادو بیری ئازادو بۆچوونی جیاجیاو سەربەستی ڕەخنە

لەخـۆگرتن بێـت. هەمیـشە کوردسـتانی نـوێ گوڵـدانی سیاسـەتی چەپکە گوڵەکە بێت.

دیارە خۆشتان دەزانن کەسەرچاوەی ئیلهامو پشت بەستنو پشت ئەستووربوون بەوەی لەسەرەوە باس کران بریتین لە:

1- پرۆگـرامو پەیـڕەوی ی.ن.ک کەلەمـادەی یەکو دوویـدا جـۆری ئەو کـوردەوارییە نیـشان دراوە کەخەبـاتی بـۆ دەکەیـنو جـاڕی گەردوونی مافی مرۆڤیش کـراوە بەخـاڵێکی سـەرەکیو سـەرەتایەکی سەرەکی ی.ن.کو لەهەردوو بەندیشدا هاتووە:

(یەکەم: ی.ن.ک خەبـات دەکـات لەپێنـاوی دیموکراسـی و ئازادیو یەکسانیدا دژی دکتـاتۆریو جەنـگو داگیرکـردنو دەسـت درێژی، دژی چەوسـاندنەوەی نەتەوەییـو چینـایەتیو دینیـو دژی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ. دژی شۆڤێنزمو کۆنەپەرستیو تیـرۆر. لەپێنـاوی مـافی چـارەی خۆنووسـینو هاوکـاریو پـێکەوە ژیـانی گەلان بەئاشتیو تەبایی.

دووەم: ی.ن.ک خەبـات دەکـا بـۆ جێبەجێکردنـی راگەیانـدنی جیهانی مافی مرۆڤ) هەروەها لەبەندی دووەمـی پەیـڕەوی نـاوخۆدا پێناسەی ی.ن.ک بەم شێوەیەیە:

(یەکێتیـی نیـشتمانیی کوردسـتان رێکخراوێکـی سۆسـیال دیمـوکراتە، لەپێنـاوی دیموکراسـیو ئـازادیو یەکـسانیدا. دژی دیکتاتۆریو جەنگو داگیرکـردنو دەسـتدرێژی دژی چەوسـاندنەوەی نەتەوایەتیو چینایەتیو دینی، دژی پێشێلکردنی مـافی مـرۆڤ، دژی تیـرۆرو شـۆڤێنیزمو کۆنەپەرسـتی، لەپێنـاوی مـافی چـارەی خۆنووسـینو هاوکـاریو پێکەوەژیـانی گەلان بەئاشـتیو تەبـایی تێدەکۆشێ).

2- نەریتو رەوتی خەباتی ی.ن.ک لەسەرەتایەوە هەتاکو ئێمڕۆ کەهەمیشە دروشمی دیموکراسیو مافی مرۆڤو دابینکردنی ئازادیو ژیانی بۆ نووسەرانو ئەدیبانو هونەرمەندان هەڵگرتووە.

3- سەروەرییەکانی ی.ن.ک، سەروەرییە زۆرو زەوەندەکانی لەلایەنە جیاجیاکانی ژیانو خەباتە جیاجیاکاندا.

4- سیاسەتی نوێی گەشەپێدانو پێشکەوتنی خۆشمان.

هەڤالان

جارێکیتریش دڵنیاتان دەکەمەوە، کە ی.ن.کو بەندەی موخلیسیشتان وەک سکرتێری گشتی ی.ن.ک وەک هەمیشە یاریدەدەرو پارێزەرو پشتیوانتان دەبێت لەپیادەکردنو پەیڕەویکردنی ئەوسیاسەتە نەگۆڕەدا.

بۆپێشەوە، بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتنی مەزنتر لەهەموو ڕوویەکەوە بۆئەوەی رۆژنامەکەتان ببێتە زمانی ئەوانەی بێکەسو بێبەشو بێپشتیوانن لەسکاڵاکردنو رەخنەگرتنو داواکردنی داخوازیو مافە ڕەواکانیان.

بۆ پێشەوە بەرەو خۆگونجاندن لەگەڵ گیانی پێشکەوتن لەچەرخی بیستو یەکەمیندا.

هەرشادو سەرکەوتووبن

برای دڵسۆزتان

مامجەلال

قەڵاچوالان

**2000/1/12**

ژمارە (**2046**)، رۆژ (**2000/1/13**)

# ئەمجارەشیان ئەزی تێدا شەرمەزارم!

لەهەمـوو هەڵە شـاخدارەکانی نوسـینەکانی کوردسـتانی نـوێدا "ئەزی تێدا شەرمەزارم"، هۆیەکانی ئەو هەڵانەش دەگەڕێتەوە:

1-بۆ پەلەپەلکردن لەنوسین، بێخوێندنەوەی سـەرچاوەکان یـان پرسـیار لەشـارەزاکانو 2-بـۆ نزمـی ئاسـتی هوشـیاریی سیاسـیو ئاگایی جهانیو خۆماڵیو 3-بۆ چاک شارەزانەبوون لەمێژوی خەباتی گەلەکەمـانو 4-نەبـوونی سـەرچاوەکانی زانیـاری لەئەرشـیفی ڕۆژنامەکان داو هەندێ هۆی تر.

لەلاپەڕە (5)ی ڕۆژنـامەی کوردسـتانی نـوێدا ڕۆژی (6/21)، لەباسێک دا لەسەر پێشمەرگە دکتۆرەکـان بـاس کـراوە، کە د.خـدر مەعـسووم هەورامـی یەکەمـین دکتـۆری خۆبەخـشی شـۆڕش بـووە. ئەمەیـان راسـتە، بەڵام پـاش ئەوە نوسـراوە کە، "دوای راپەڕینـی گەلانی ئێران دژ بەرژیمی شا، د.ئیبراهیمی عەلی زادە لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە رووی کردە ناو پێشمەرگەو .... هتد".

هەی ئافەرین نوسەری باسەکە! نەزانی دکتۆرەکەی لەکوردستانی ئێـران هـاتووە- نـاوەکەی د.جەعـفەر شـەفیعی بـوو، کەپاشـان لەڕووداوێکـی دڵتەزێنـدا لەڕێـگەی بەغـدا شـەهید بـوو. هاتنەکەشـی پێش راپەڕینی گەلانی ئێران بوو. هاوڕێیەکەشی مامۆستا سـاعیدی وەتەندۆسـت بـوو، کە بەموهەندیـسیی چەنـد هەزار دینـارێکی پاشەکەوت کردبوو، ئەویشی بۆ شۆڕش هێنابوو.

هەی ئافەرین نوسەر، کەنەزانی مامۆستا ئیبراهیمی عەلی زادە کێیە؟

جارێ مامۆستا عەلی زادە دکتۆر نییە، بەڵکو موهەندیسەو لێپرسراوی کۆمەڵەی ئێرانە (سازمانی کوردستانی ح. ک. ئێران)، وا بۆ چەندین ساڵیش دەچێ لەکوردستانی عراقدا دەژیەت. ئەویش پێش راپەڕینی گەلانی ئێران سەردانی کوردستانی عراقی کردبوو، بەچەندین بار جلو پێڵاوو خواردەمەنیو داوودەرمانەوە!

ئنجا هەی ئافەرینو چەندین تەبریک بۆ سەرنوسەری لاپەڕەکەش کەوا بەچاکی ورد دەبێتەوە لەنوسینەکانو وا بەبارەباریش هەڵەی شاخداری ئەوهاشی بەسەریا تێپەڕ دەکات.

هەڤالانی کوردستانی نوێ جارێکیتریش ئەزی تێدا شەرمەزارم! بەڵام نازانم ئێوە چی؟

ژمارە (**2486**)، رۆژ (**2001/6/23**)

## بۆچی ئەم جارەش هاتمە کایەکەوە؟

مـــاوەیەک لەمەوبەر هەڤـــاڵ مەلا بەختیـــار ئاگـــاداری کـــردم کە بەپێچەوانەی نەریتو سیاسـەتی ی.ن.ک هەڵـڵایەک لەسـەر بـنکەی گەلاوێژی نوێ دروست کراوە سەبارەت بەچاپکردنی نوڤلێتی مـولازم تەحسینو شـتیتریش کە لەلایەن د.فەرهـاد پیـر بـاڵەوە نووسـراوە. بەوەش نەوەســـتاون بەڵکـــو شـــکاتیان بـــردۆتە بەردەم دادگـــاو هەڕەشــەش لەقەدەغەکردنــی هــاتوچۆی د.فەرهــاد دەکرێــت. بــۆیە منیش هەر دەستبەجێ رەخنەم لەو دەزگایەی ە.پ.ک گرت کە ئەم بەزمەی ناوەتەوە! و داوام کرد داواکەیان لەدادگا وەربگرنەوەو رێـزو تەقدیریش هەروەک جاری جاران بۆ بنکەی گەلاوێژی نوێ بپـارێزنو د.فەرهــاد پیــر باڵیــشی بەرێــزو تەقــدیرەوە پێــشوازی لــێ بــکەنو بەگەرمـــی بەخێـــری بهێـــنن بـــۆ ســـلێمانی. خـــۆ ئەگەر گلەیـــیو گازندەیــشیان لە نووســینەکەی هەیە ئەوا بــا بەنووســین وەڵامــی بدەنەوەو چی بەڕاستورەوا دەزانن نیشانی بدەن.

بـۆچی ئەمجـارەش هـاتمە کـایەکەوە؟ چـونکە وام هەسـت کـرد خەریـکە دروشـمی نـانو ئـازادی بـۆ نووسـەرانو هونەرمەنـدان کـاڵ دەبێتەوە.

هیـوادارم لەگەڵ باشـتربوونی وەزعـی ئـابووری حکومەتەکەمـان هەوڵ بــدات وەزعـــی ژیـــانو گـــوزەرانی ئەدیـــب (نووســـەران)و هونەرمەندانیش باشتر بکـات. هیـوادارم کارێـک بکەیـن لەو پـرۆژەی

خانوو دروست کردنەی میری خۆمان بەدەستیەوەیەتی بەدابین کردنی زەویو ئەو یارمەتییەی لە (سیلف بیلدینگەوە) دێت بەشی ئەدیبانو هونەرمەندانیش بدات.

هیوادارم هەوڵدەن کۆمەڵەیەکی هەرەوەزییان بۆ دروست بکەینو هەوڵدەین بازاڕی هەرزانو یانەی تایبەتیشیان بۆ دابین بکەین.

دەربارەی ئازادیش دەمەوێ دەپاتی بکەمەوە کە بەلای (ی.ن.ک)ەوە ئازادی بیروڕا دەربڕین هەم مافی رەوای مرۆڤی کوردستانەو هەم ئەرکێکی پیرۆزە.

بەلای منەوە، جگە لەجغزکێشان بۆ شەڕەجنێوی شەخسیو موهاتەرات، نابێ ئازادی بخرێتە ناو جغزی سانسۆرو سنوور بۆ دانانەوە، بەوەی بسەپێندرێ کە ئەمە باشەو ئەمە خراپە ئەمە دەشێ بگوترێو ئەمەی تریان بڤەییە.

ئازادی لەپێشەوە ئازادی رای جیاواز دەربڕینە: ئازادی موعارەزەیە: ئازادی (نا)و (وەنیە) گوتنە. ئازادی دەربڕینی هەموو هەستو خوستێکی ئینسانییە.

دروشمەکەمان (دابین کردنی نانو ئازادی)ش دەبێ گەشە بکات: دەبێ پەرەی پێبدەین لە ناو هەڵمەتی گەشەپێدانی هەمەلایەنەی ژیانی خەڵکی کوردستاندا.

راستە پێشمەرگە هێزێکی فیداکارو خاوەن سەروەری زۆروزەوەندە لەمێژووی گەلەکەمان، بەڵام دوور لەڕەخنەو باس لەسەر کردن نیە.

پێشمەرگەی قارەمان کە لەگەڵ دوژمن بەگوللە پارێزگاریان لە خۆیانو گەلو نیشتمان کردوە، با لەگەڵ نووسەرانو رەخنەگرانیش بەوشەو بەنووسینو بەنیشاندانی راستوڕەوایی خەباتەکەیانو

هەڵسوخوستیان پارێزگاری لەخۆیان بکەن. چەکی دەستیان بۆ پاراستنو گەشە پێدانی ئازادی هەڵگرتن، نەک بۆ هەڕەشە لەئازادیو تۆقاندنی رەخنەگرو نووسەران با لەسەر هەقیش نەبن.

چوونە بەردەم دادگاش بۆ دیفاعی کەرامەتی شەخسیو شەرەفی خۆیانو خانەوادەیان نەبێت کارێکی ناڕاستو ناڕەوایە.

دەبا لەگوڵزاری کوردستاندا دەیان گوڵ بپشکوێ.

چەپکە گوڵ جوانترە لە تاکەگوڵ هەرچەندە زۆر جوانو نایابیش بێت، چونکە ئەویش لەناو چەپکەگوڵەکەدا دەبێت لەگەڵ چەندین گوڵی جوانیتر. پەرەپێدانو گەشەپێدانی دروشمی دابینکردنی نانو ئازادی بۆ نووسەرانو ئەدیبانو هونەرمەندان ئا ئەمانە دروشمە پیرۆزەکانی (ی.ن.ک)ە کە نابێ هەرگیز فەرامۆشی بکەین.

ژمارە (**2639**) رۆژ (**2001/12/22**)

# دێوە زەبەلاحەکە بەئاگا هاتووە
# بەڵام سەرقاڵی بنیاتنان و
# گەشەپێدانی نیشتمانەکەیەتی

-1-

لەناپلیۆن پۆناپارت دەگێڕنەوە کەگوتوویەتی: لێگەڕێن با زەبەلاحی چین بخەوێت، چونکە هەرکاتێک لەخەو هەڵسێت ئەوا دنیا دەهەژێنێت، ئەگەر مەبەست لەهەژاندنی جیهان بەو مانایەبێت هەرکاتێک رابوو گەلان و کۆمەڵانی خەڵک هەڵدەسێنێت و چاویان بۆ رزگاری و ئازادبوون دەکاتەوە، ئەوا ناپلیۆن باشی پێکاوە، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوەبێت جیهان هەراسان دەکات و سەرئێشەو گیروگرفت بۆ گەلان دروست دەکات ئەوا هەڵەیەکی گەورەی کردووە. لەم سەردانەی ئەو دواییەماندا بۆ چین ئەو دێوە زەبەلاحەمان بینی کە بەتەواوەتی بەئاگاهاتووەو لەوپەڕی هۆشیاریدایە، بەڵام بینیمان سەرقاڵ و خەریکی بنیاتنانی نیشتمانەکەی و شادکردنی گەلەکەی و گەشەپێدانی ئابووری و کەلتوورەکەی و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەی بوو بەشار و دێهاتیەوە.

بەڵێ ئەو دێوە زەبەلاحەمان بەئاگاداری و ئەوپەڕی هۆشیاریی بینی، بەڵام داوای پێکەوەژیانی ئاشتییانە لەنێوان گەلان و سیستمە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان و خۆدوورگرتن لەگرژیی و ئاڵۆزیی لەپەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و چارەسەرکردنی

کێشەکان تەنانەت ئاڵۆزترینیان دەکات، ئەویش بەوتوویژی هێمنانەو هەوڵدانی هاوبەش بۆ گەیشتن بەئامانجە لەتوانادابووەکان، بەڵێ ئەو دێوە زەبەلاحەمان بینی دەرک بەلێپرسراوێتییە نیشتمانیو نێودەوڵەتییەکانی دەکاتو بەڕوویێکی خەندەئامێزو رۆحێکی خۆش مەشرەبو لەخۆبوردنێکی زۆرو ئەدەبێکی لەڕادەبەدەرمان بینی، تەنانەت لەو مەسەلە نیشتمانییە هەستیارانەشیدا وەک کێشەی تایوانی چینی کەجەنەراڵ جیان کایشک-ی بەزیو لەولاتی دایکی دوورخستبووەوە، بینیمان لەسەرخۆو جڵەو لەدەست نەداوو زاڵە بەسەر سۆزی کڵپەسەندووی نیشتمانپەروەریێتی چینیو پابەندی چارەسەری سیاسیو ئاشتییانەیە بەپێی بنەمایەکی مەنتیقی گونجاو، ئەویش چین یەکەو دوو سیستمی سیاسیی جیاوازە، لەگەڵ ئەوپەڕی نەرمی نواندن لەگەڵ ئەو هاوولاتییە چینییانەی لەتایوان دەژین کەزیاتر لەحەوت سەد هەزار چینی تایوانی بەتەنیا لەشەنگەهای دەژینو هەموو مافێکیان دراوەتێو هەندێک جاریش بەئیمتیازی تایبەتییەوە.

چینی رەسمیی نابینیت پەلەی لەیەکگرتنەوە بێت، ئەگەرچی ئارەزوویەکی بەگوڕی میللی بۆ یەکگرتنەوە هەیە، بەڵکو ئەوپەڕی نەرمیو لێبووردەییو پشوودرێژییو دان بەخۆداگرتن نیشان دەدات لەبانگەوازکردن بۆ گێڕانەوەی تایوان بۆ ئامێزی نیشتمانی دایک، رەنگە هەر ئەوکاتە راشکاویو جددیەت دەربکەون کەهێندێک کەس لەتایوان باس لەجیابوونەوە لەنیشتمانی دایک دەکەنو رووبەڕووی رەتکردنەوەیەکی لێبڕاوانە لەلایەن نیشتمانی دایک سەبارەت بەجیابوونەوەو پابەندبوونی شێلگیرانە بەیەکێتی نیشتمانیی دەبنەوە.

لێپرسـراوانی چـین بەهەمـوو جـددیەتەوە بـاس لەسـێ ئەرکـی پێشینە دەکەن کەبریتین لەگەشەپێدانو پاشان گەشەپێدانو دواجار گەشەپێدان، ئەو چینە زەبەلاحە دەبینـی بەڕاسـتی بـازێکی گەورەی راستەقینەی لەهەموو بوارە جیاجیاکانی ژیـانی ئـابووریو بنیاتنـانو شارستانیو کەلتووریدا داوە.

بـۆ ئەوەی سـەر لەخـوێنەر نەشـێوێنم سـەبارەت بەتێگەیـشتنی دەرهەق بەچینی گەشەکردووی هەڵکشاو بەرەو ترۆپکی پێشکەوتنو گەشەکردنو تێگەیـشتنی بـۆ سیاسـەتەکانی چـین لەبـارەی عیـراقو تایوانی چینیو بارودۆخەکانی ناوخۆی سەری لـێ تێـک نەدەم، ئەوا من ئەو وتارانە بەکورتی دەنووسـم کە بەنیـازم بەزنجیـرە سـەبارەت بەچین بیاننووسم، ئەویش لەبەر رۆشنایی بینینی ئەم دواییەمان بـۆ چـین کەئـێمەی وەفـدی یەکێتیـی نیـشتمانیی کوردسـتانیان نـوقمی سـۆزێکی لەڕادەبەدەری مرۆڤدۆسـتانە کـرد بەرامـبەر عیـراقو گەلەکەیو بەرامبەر بەگەلی کوردو یەکێتیی نیـشتمانیی کوردسـتانو خەجالەتیـان کـردین بەو میواندۆسـتییەی چینـی پـێ ناسـراوەو ئەو ئەدەبەی لەلێپرسراوانی بەدی دەکرێ، وەک ئەوەی ئـێمە میوانـداری ئەوان بکەین نەک ئەوان، جا بۆ وتاری ئایندە.

# سەردانێکی نوێ بۆ چینی نوێکراوە

-2-

بەڕێز چین هاوزو-ی سەرۆکی کۆمەڵەی چین بۆ دۆستایەتی لەگەڵ گەلان بانگهێشتی کردین تا لەگەڵ ژمارەیەک لەهەڤالانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کەخۆمان دیارییان دەکەین سەردانی چین بکەین، ئەوەبوو لەسەر ئەوە رێک کەوتین کە وەفدەکەی ی.ن.ک لەهەڤالان مام جەلالو خاتوو هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەدی سەرۆکی کۆمەڵەی منداڵپارێزو سەرپەرشتیاری دەزگای رووناکبیریی خاکو تەلەفزیۆنی کوردساتو بەڕێز عومەری سەید عەلی ئەندامی دەستەی کارگێڕی مەکتەبی سیاسیو بەڕێز جەلال جەوهەری ئەندامی مەکتەبی سیاسیو بەرپرسی کەرکوکو ئەندامێکی دیکە کەنەیتوانی بگاتە وەفدەکە پێکبێت، وادەی دووەمی سەفەرەکە بۆ رۆژی 2003/8/3 دەستنیشانکراو سەفەرمان کرد بۆ عەممانو لەوێ دۆستی بەڕێز مستەفا پاشا ئەلقەیسی-ی وەزیری پێشووو نێردراوێکی دیوانی شاهانەی هاشمی لەفڕۆکەخانە لەپێشوازیماندا بوون، ئەوەبوو لەئوتێلی مێریدیان میوانی دیوانی شاهانە بووین کەخاوەن شکۆ شاعەبدوڵڵای دووەم بەر لەسەفەرکردنی فەرمانی لەم بارەیەوە بەدیوان دابوو.

پاش شەوێک حەسانەوە لەعەممانی پێشکەوتووو ئاوەدان بەفڕۆکەی شاهانەی ئوردنی لەڕێگاماندا بەرەو چین رووکرده

دوبەیو درەنگانی شەو گەیشتینو سەفەرەکەمان بۆ چین سەعات سێو نیوی بەیانی دەستیپێکرد، بەڵام برایانی میواندۆستی ئیماراتی ئەوانەی کە لەپێشوازیماندابوون سووربوون کە لەگەڵماندا بمێننەوە تا (دوبەی)مان جێهێشت، برایان ئەبو ئەحمەد (سوڵتان ئەحمەد سەلیم) شێخ راشد ئەلسوێدی سووربوون بمێننەوەو بەرپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوەی وەزارەتی دەرەوەشیان لەگەڵدا بوو کە لە (ئەبوزەبی)یەوە بۆ پێشوازیمان هاتبوو، بەڕاستی نموونەی لوتفو خۆشەویستیو برایەتی بوون.

فڕۆکەکەمان لەبانکۆک بۆ ماوەی یەک سەعات وەستا دواتر درێژەمان بەسەفەرەکەمان دا بۆ هۆنگ کۆنگو ئێوارەی رۆژی (2003/8/5) گەیشتینە ئەوێ، لەفڕۆکە ئیماراتییەکەدا چاومان بەمیواندارێک کەوت کەناوی (باشوور) بوو پێی گوتین کە بەڕەچەڵەک کوردەو لەناو فڕۆکەکەدا زۆر بایەخی پێداین، لەهۆنگ کۆنگ-ەوە بەفڕۆکەیەکی چینی بەرەو بیسیجینک (پەکین) بەڕێکەوتینو ئێوارە گەیشتین، هەر کە لەفڕۆکەکەش دابەزین بینیمان ریزێک پێشوازیکەری چینی بەئەدەبێکی لەڕادەبەدەری چینیانەوە وەستابوون کە ئەو بەڕێزانەبوون؛ 1-فنگ زوئۆکو (Feng Zuoko)ی سکرتێری گشتی کۆمەڵەی دۆستایەتی چین- عەرەبیو بەرپرسو بەڕێوەبەری گشتی کاروباری ئاسیاو ئەفریقیا لەکۆمەڵەی دۆستایەتی چین لەگەڵ گەلان کە بەناوی بەڕێز چین هاوزو-ی سەرۆکی کۆمەڵەکەو سەرکردە لەچین بەخێرهاتنی کردین، کەکوڕی مارشالی ئەفسانەیی چین جین یی-ی سەرکردەی لەشکری بەناوبانگی چوارەمی نوێ لەجەنگی رزگاریی چینەو 2-لی لیان خی (Li Lian He) بەرپرسی باکووری کەنداوو باکووری ئەفریقیا لەوەزارەتی دەرەوەی چین کە بەدرێژایی سەردانەکەمان یاوەرمان

بوو 3-خواشین (Huaxin) وەرگێڕی عەرەبیو 4-یانگ گوئو جیانک بەرپرسی ئاسایش لەوەزارەتی ناوخۆو هێندێک لێپرسراوی دیکە، ئەوەبوو بەگەرمیو خۆشەویستییەوە پێشوازییان کردینو ئێمەیان بردە هۆڵی شەرەف (Vip)و سەرلەنوێ بەخێریان هێناینو گوتیان: (ئەم سەردانەتان بۆ ئێمە زۆر گرنگەو بەدەستپێکی پەیوەندییەکی نوێی دەزانین لەگەڵ عیراقداو تازەکردنەوەی پەیوەندیشە لەگەڵ بەڕێز جەلال تاڵەبانی دۆستی دێرینی چین، هەروەها سەرەتای پەیوەندی چینە لەگەڵ گەلی کورد بەگشتیو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش بەتایبەتی)، ئێمەش لای خۆمانەوە سوپاسێکی زۆرمان کردنو بۆمان دووپاتکردنەوە کەئێمەش بەبایەخێکی تایبەتەوە دەڕوانینە ئەم سەردانەو هیوادارین بەو سەردانە پەیوەندی چینو عیراق پتەوبێتو پەیوەندیشیان لەگەڵ گەلی کورد تازەبکەنەوە، بۆشمان دووپاتکردنەوە کەخۆم بەسیفەتی دۆستێکی دێرینی چینو گەلە مەزنەکەی شانازی بەو هەموو بەخێرهێنانە گەرمەو پێشوازییە دۆستانەیە دەکەم کەنیشانەی گرنگیدانی چینییەکان بوو بەسەردانەکەمانو پتەوکردنی ئەو ئارەزووانە بوو کەئێمەی بەرەو چین برد بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانمان لەم سەردانەماندا، پاشان بەچەند ئۆتۆمبێلێکی نایاب رووەمانکردە شوێنی حەوانەوەمان لەکۆشکی میوانداریی دەوڵەت (STATE GUEST HOUEDIAPYU TAI) و زانیمان کەدەستکردی چینە بەسوودوەرگرتن لەتەکنۆلۆژیای بێگانەوە، کە گەیشتینە بەردەرگا دەستەیەک کیژۆڵەی چینی بەدوو چەپکەگوڵی جوانو دڵگیری چینی کەیەکێکیان بۆ منو دووەمیشیان بۆ خاتوو هێرۆ بوو وەستابوونو سەرلەنوێ بەهەمان دەستەواژەکانی پێشوو بەخێریان هێناینو ئێمەش سەرلەنوێ سوپاسی زۆرمان کردن.

یەکەم تێبینی ئەو گەشەکردنە گەورەیەو بنیاتنانو شەقامەکان بوون هەر لەفرۆکەخانەوە تا کۆشکی میوانداریی، فرۆکەخانەکە نویۆو لەسەر تازەترین شێوازو بەردەوام لەفراوانکردندا بوو، بیسیجینگ ی پایتەختیش کەنوێکراوەتەوەو بەردەوام لەنوێبوونەوەدایە، بەسەدان باڵەخانەی سەرکەشی تازەمان بەنەخشەسازی جۆراوجۆر لەهەردوو بەری شەقامە بەرینە رازاوەکاندا بینیو ناوەڕاستو هەردوو دیوی شەقامەکانیش بەدرەختو گوڵ رازابوونەوە.

دووەم تێبینی ئەو پاکو خاوێنییە بەرچاوە بوو کەبەشەقامو شۆستەکاندا دەبیندرا، سێیەم تێبینیش ئەو جلوبەرگە ئەوروپاییە جوانو پۆشتانەبوون کە لەبەر ژنو پیاوانی چینیدا بوون کەدەستکردی چینن، بەڵام لەگەڵ ئەو جوانیو دڵگیرییەی قوماشەکانیدا بەتایبەتیش ئاوریشمی بەناوبانگی چینی، هەرزان بوون.

ژمارەکانی (**3160، 3164**)، رۆژانی (**2ـ2003/9/7**)